زنجیرەی
خێزانی
سەردەم

THE WEST AND
THE CORRUPTION OF CHILDHOOD

05



# ڕۆژئاوا و ژەهراوییوونی منداڵی

## کۆتایی چەرخی پاکێتی

ئامادەکردنی:
**ناوەندی ڕەواسخ**

وەرگێڕانی:
**کاوان کامەران**

# ڕۆژئاوا و ژەهراویبوونی منداڵی

کۆتایی چەرخی پاکێتی

**ئامادەکردنی: ناوەندی ڕەواسخ**

**وەرگێڕانی: کاوان کامەران**




چاپی یەکەم ١٤٤٥ك -٢٠٢٤ز

**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەلیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 65

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

\ tafseeroffice

RAWASEKH

رواسخ

اصدارات ◆ دراسات ◆ برامج

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

کامەران، کاوان

ڕۆژئاوا و ژەهراویبوونی منداڵی کۆتایی چەرخی پاکێتی، ناوەندی ڕەواسخ(ئامادەکار).کاوان کامەران (وەرگێڕ)

١٢٠ لاپەڕە،

١٤*٢١ سم

بابەت، فیکری، پەروەردەیی

ISBN: 978-9922-690-54-4

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (١٠٠٥) ی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە.


"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"


دیزاین، نووسینگەی تەفسیر

## ناساندنی زنجیرەکە

گەنجـــی موســـڵمان بە گشـــتی و کۆمەڵگـــای کـــوردەواری بە تـــایبەت؛ ڕۆژانە ڕوبەڕووی بیـــرۆکەی نـــوێی نابـــاو دروســـتکراو، پتـــر ئاڕاستەکراو دەبنەوە. مەبەست لەم بیرۆکە ئاڕاستەکراوانەش، تێکدان و سەرگەردان کردنی مرۆڤ بەگشتی و چەند کۆمەڵگایەك بەتایبەت؛ بۆ مەرامی بڵاوکردنەوەی چەندەها بیرۆکەی بێژمارە.

لەم سۆنگەیەوە نووسینگەی تەفسیر وەك کاری هەمیشەیی خۆی بە ئەرکـــی زانیـــوە بەڕووی هەر بیرۆکەیەکـــی نابـــاو هەڵبشـــاخێ کە ئاڕاستەی کۆمەڵگاکەمان دەکرێت.

لەم ڕووەوەش، هەڵساین بە وەرگێڕان و نووسینی زنجیرەیەك کتێبی سادە و ڕەوان، بەجۆرێك خوێنەرانی قۆناغی پێشکەوتووی بنەڕەتـی و ئامادەیی بتوانن بە ئاسانی هەرسی بکەن و تەنانەت زنجیرە کتێبەکە بەجۆرێـــك دیـــزاین کـــراوە؛ کە خوێنـــدکارانی زانکـــۆ و مامۆســـتا و پسپۆرانیش سوودی گەورەی لێ ببینـن و ببن بە هەوێنـی سـەرچاوە گرنگەکانیان.

# لە تەلەفیزیۆنی ئەوروپییەوە...
# ئەوەی لە کورتەی هەواڵەکاندا نایبینیت

لە دوانزەی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٤٩٢ی زایینی)دا، کەشتیی گەڕیدەی ئیتالی (کریستۆفەر کۆڵۆمبۆس) لە سەرزەوییەک لەنگەری گرت، کە پێشتر ئەوروپا پێی ئاشنا نەبوو؛ کۆڵۆمبۆس وای دادەنێت ڕۆژهەڵاتی هیندە، بەڵام هیند نەبوو، بەڵکو ئەمریکای نوێیە!

وەرن با ئەم جیهانە نوێیە بگەڕێین (بەتاڵان ببەین!)

یان وەک (ئەریستۆڤان) لە شانۆی (زەردەواڵەکان)دا دەڵێت: "بە یەکەم کەسەوە بدەن، کە دەیبینن، مردنی بکەنە سەرچاوەی ژیانتان".

سەد و بیست و دوو ملیۆن لە دانیشتوانە ڕەسەنەکان، چوارسەد نەتەوە لە هەر چوار پارچەی جیهانەوە پێش هەزاران ساڵ کۆچیان کرد بۆ ئەم پارچە زەوییە و تێیدا جێگیر بوون[١]، ئەرکی خۆیانیان جێبەجێ کرد و ئەوەی بەشیان بوو لە مێژوو، ژیان. ئێستا پیاوی سپی خاوەنی ئەمریکایە[٢]، کە ئەم هەموو ملیۆنە لەناودەبات،

(١) هنري دوبينس: ارقامهم التي هزلت.

(٢) منير العكش: أمريكا والإبادات الجماعية.

دەستەیەکی کەمیان نەبێت هیچیان جێناهێڵێت. دەستەیەک، کە ناگاتە چارەکە ملیۆنێک مرۆڤ، هەتا ساڵی (١٩٠٠ی زایینی)، کە ئەمە گەورەترین جەنگی قەڵاچۆیە لە مێژوودا.

ئەوە خوێنڕێژیی ئەوروپییە، کە مرۆڤی پێش سەوزایی سووتاند، پاشان دێت و سەری بە سەرماندا هەڵدەبڕێت و قوربانییەکانی بە "ئیرهاب" تۆمەتبار دەکات.

ئەو ئیرهابییە کێیە، کە شاشەی تەلەفیزیۆنەکان لێی بێدەنگن؟!

# گەلی خودا

(قەدەری ئەو هنـــدییەی[٣] بەرامـــبەر ئەنگلۆسەکســـۆنی دەوەستێتەوە، وەک قەدەری ئەو کەنعانییەیە، کە بەرامبەر ئیسرائیلی دەوەستێتەوە: ئەوەیش قەدەری مردنە).

(جەیمس بۆلدین، نوێنەر لە کۆنگرێسی ئەمریکی لە نێوان ١٨٣٤- ١٨٣٩ز)

لە ساڵی (١٦٣٠ی زایینی)، پاشای بەریتانیا (چارلزی یەکەم) ئیمتیـازێکی نـوێی دەرکـرد بە داگیرکردنـی هەمـوو ئەو زەوییـانەی دەکەونە نێوان هێڵی پانیی چل بۆ چل و هەشت لە باکورەوە، یان ئەو ناوچـانەی بە (ئینگلـتەرای نـوێ) ناسـراون، کە هاوکـات بـوو لەگەڵ شـەڕی تـائیفیی مەسـیحییە ئـایینخوازە جوداخوازەکـان لە ئینگلـتەرا لە لایەک و کەنیسـەی ئینگلیـزی لە لاکەی تـرەوە، کە بـووە هـۆی کـۆچکردنی ئەم جوداخـوازانە لە وڵاتەکەیـانەوە بـۆ ڕووگەیەکی تر.

بۆ کوێ؟

بۆ جیهانی نوێ..

بە دیاریکراوی داگیرگەی (پلیمۆس)، خاکی بەڵێندراو!

بیرمەنـد و مێژوونووسـی فەلەسـتینی (منیـر العکـش) دەڵێـت:

---

(٣) پێویست دەکات بە دانیشتوانە ڕەسەنەکان ناویان ببەین، بەڵام بەهۆی ئەوەی لە سەرچاوەکاندا بە (هیندی) ناویان هاتووە، ئێمەیش بۆ ئاسانیی تێگەشتن هەر ئەوە بەکاردەهێنین. (وەرگێڕ)

"هندییەکانی (بیکۆ) یەکەم کەس بوون پێشوازییان لەم حاجییانە کرد و لە مردن لە برساندا ڕزگاریان کردن، داستانێکی مرۆڤانەیان بەنەمری هێشتەوە، کە دواتر بە جەژنی سوپاسگوزاریی ئەمریکی ناونرا، بەڵام ڕووەکەی تر دەڵێت بێئەمەکی ناونیشانی ڕاستەقینەی ئەم جەژنە سوپاسگوزارییەیە؛ سیاسەتی زەبوونکردن و تۆقاندن، کە ئەم حاجییانە گرتیانەبەر، باشترین دەربڕینی سوپاسگوزاریی میوانداریی هیندی بوو، زۆرجار ئەو هیندییەی بەدیارییەوە دەهات بۆ لایان دەیانکوشت؛ بەڵکو تەماحی هاندەریان دەخستە بەردەمیان، تاکو ڕایاندەکێشان و دەیانکوشتن".

بەپێی ئەوەی (جۆن میسۆن) دەیگێڕێتەوە، کە بنچینەی داگیرگەی (کۆنتیکتی)ی دانا، کوشتنی ڕاستەوخۆ چەکی دڵخوازی دەستی حاجییان بوو، لە هەمان کاتدا سووتاندنی زەوی و کێڵگەکان هۆیەکی زیادەی ڕیشەکێشکردن بوو[٤]. ئەو سەرکردەیە، کە باوەڕی بە پێشبینییەکەی (تۆماس هۆکەر) بوو، بەردەوام لەسەر زمانی بوو لە کاتی جەنگەکانی قەڵاچۆکردنی بیکۆدا: "دەبێت ئەو نانەبن، تاکو مربوون لێیان دەخۆین".[٥]

لە ساڵی (١٩٧٠ی زایینی)دا[٦]، وەزارەتی بازرگانی لە ویلایەتی (ماساچۆسێت) نێردەیەکی نارد بۆ پاشماوەی هۆزی (وامبانۆگ)، تاکو قسەکەرێکیان بنێرن و لەگەڵیان بەشدار بێت لە زیندووکردنەوەی سێ سەد و پەنجایەمین ساڵیادی جەژنی

(٤) منير العكش: أمريكا والإبادات الجماعية.
(5)Richard Drinon, Facing Wesst.
(6)Bulletin V.10, P.6, 1979.

سوپاسگوزاریدا، بە مەرجێک وتارەکە نیشانی وەزارەت بدات بەر لە پێشکەشکردنی لە ئاهەنگەکەدا؛ (فرانک جەیمس)یان هەڵبژارد، کە نامەیەکی بۆ ناردن و تێیدا نووسیبووی: (تەنیا جەژنی ئێوەیە، جەژنی من نییە، من بە دڵێکی ئەنجن ئەنجنەوە سەیری گەلەکەم دەکەم، دوای گەیشتنی حاجییان بە دوو - سێ ڕۆژ دەسیان کرد بە دزینی گۆڕی باوباپیرانم).[٧]

ئەوە قەڵاچۆکردنە پیرۆزەی مافی بڕیاردانی ژیان و مردن و دڵخۆشی و ناخۆشیی دانیشتوانی ئەم زەوییە نەناسراوە دەداتە دەستی گەڵی هەڵبژاردەی خوا، هەر لەسەر هەمان بنچینەیە زایۆنییەکان زەوییەکانی فەلەستینیان داگیر کرد، گەلی هەڵبژاردە هیچ وزەیەکیان لەم قەڵاچۆکردنەدا بەفیڕۆ نەدا.

## هۆکاری سروشتی و کوشتنی پیرۆز

(بە فەزڵ و نیعمەتی خوا، لە ساڵی ڕابردوودا لە داگیرکەرەکانمان دوو سێ گەورە و چەند منالێک نەبێت نەمردوون، بەدەگمەن باسی مەلاریا و نەخۆشییەکانی ترمان دەبیست. هەرچی دانیشتوانە ڕەسەنەکانە نزیکەی هەموویان بە ئاوڵە مردن، بەمە خوا پسوولەی خاوەندارێتیی ئەم زەوییەی پێداین).

بەم وشانە، (جۆن وینسرۆب)، یەکەم حاکمی داگیرگەی

(7)Frank James and the hittory of the Nattional Day of Mourning
https://shorturl.at/ABLNV .

(ماساچوسێت) یەکێک لە نامەکانی تۆمار کردبوو لە بەرواری ٢٢ی ئایاری ساڵی (١٦٣٤ی زایینی)دا.[٨]

زمانحاڵی ڕای ئینگلیزییە، کە مێژوو بە قەڵاچۆکردنی هیندییە سوورەکان مۆرک دەکات؛ ئێمە نەمانکوشتن بەڵکو هۆکاری سروشتی کوشتنی، نە دیارییەکانمان بە ئاوڵە پیس کرد پێش ئەوەی پێیان بدەین، نە لە زستانێکی سەهۆڵبەنداندا بە پیادە ڕامانگواستن و بووبینە هۆی لەناوبردنی زۆربەیان.

نەوەکانی داهاتوو، ئەوە هۆکاری سروشتی بوو!

باپیرانتان بێتاوانن لە خوێنی ئەوانە!

بەڵام ڕاستی شتێکی تر دەڵێت لە وتەی (ویلیەم برادفۆرد) فەرمانڕەوای داگیرگەی (پلیمۆس)، کە دەڵێت:

"لەو شتانەی خودا ڕازی و دڵخۆش دەکات ئەوەیە سەردانی ئەم هندییانە بکەیت و لەگەڵ خۆتدا نەخۆشی و مردن ببەیت، بەم شێوەیە لە هەر هەزار کەسێکیان نۆ سەد و پەنجایان دەمرێت، زۆرێکیان بۆگەن دەکەن بەبێ ئەوەی کەسێک بدۆزنەوە بییاننێژێت، دەبێت باوەڕداران سوپاسی خوا بکەن بۆ ئەو چاکە و بەخشینەی پێیداون".[٩]

لە کتێبی (ژمارەکانیان، کە کەمنرخ کراوە) نووسینی (هێنری دۆبێنس)، ڕاستیی لافی ئەورووپییەکان دەربارەی (هۆکاری سروشتی) دەردەخات، دەڵێت: "هندییەکان لە ماوەی چوار سەدەی

(8) Edmund Morgan, American Slavery – American Freedom.
(9) William Bradford, Of Plymouth Plantation.

ڕابردوودا ڕووبەڕووی نەوەد و سێ جەنگی میکرۆبی بوونەتەوە لە لایەن داگیرکەرە ئەوروپییەکانەوە، بە ژمارەی: چل و یەک درمی ئاولە، چوار تاعوون، چواردە سورێژە، دە ئەنفلۆنزا، بیست و پێنج سیل و دەردەکۆپان و ڕەشەگرانەتا و کۆلێرا.

بە ڕادەیەک گەلی هیندی هەبووە لە هۆزەکەی دراوسێیەوە نەخۆشیی گرتووە و تا کۆتا دانەیان لەناوچووبوون پێش ئەوەی یەک دەمووچاوی سپییش ببینن!

چەکی بەکۆیلەکردن و برسیکردن بە هەمان شێوە کاریگەر بوو لە زەفەربردن بە هیندییەکان، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بەهۆی نەخۆشی و شەکەتی و بەدخۆراکییەوە دەمردن، ئەو خواردنەی بە کۆیلەیەکی ئەفریقی دەدرا یەکسان بوو بەوەی دەدرا بە هەشت هیندی، ئەمە خۆشەویستی نەبوو بۆ ئەفریقا، بەڵکو ئەوە بوو هیندییەکان لە ماسی هەرزانتر بوون؛ تێچووی گۆڕینیان لە تێچووی تێرکردنیان کەمتر بوو، بەڵام بۆ بەدەستخستنەوەی کۆیلەی ئەفریقی هەموو دەریایان لە پێش بوو".(١٠)

لە سەرووی ئەمەوە ڕاگواستنە زۆرەملێیەکان، کە هەزارانیان تێدا مردن، کاتێک کۆنگرێس لە ساڵی (١٩٣٠ی زایینی) یاسای ڕاگواستنی هیندییەکانی دەرکرد بۆ ڕۆژئاوای (میسیسیپی)، مافی دانیشتەی داگیرکراو بوو بیەوێت هەر هیندییەک ڕابگوازێت و بیشیکوژێت، ئەگەر وەلامی نەدایەوە(١١)، باسکردنی یەک

(10) Robert fogel and Stanly Engerman, Time on Indian Slavery in colonial times.

(١١) العكش: أمريكا والإبادات الجماعية.

گەشتمان بەسە، گەشتی فرمێسکەکان، کە تێیدا پێنج گەل ڕاگوێزران و گەلەکانی (شیروکی)، (شوتوکو)، (شیکاساو)، (کریک) و (سیمینۆل)، بە پیر و ژن و منداڵەوە بەنێو ناوچەگەلێکدا، کە کۆلێرایان تێدا بڵاوبووبووەوە، ئاردی ماوەبەسەرچوو و گۆشتی بۆگەنیان دەرخوار دەدرا.

لەم گەشتەدا لە سەدا پانزەی گەلی شوتوکو و شیکاساو مردن و سێ گەلەکەی تر بەختیان خراپتر بوو، کە تێیدا زیاتر لە نیوەیان لەناوچوون.

لەبەرئەوەی نەخۆشی و بەکۆیلەکردن و ڕاگواستن بەس نەبوون، بۆیە سێدارە و گوللە چەند قاتی تاوانەکانی تر ژیانیان چنییەوە، ئەمە سەرباری وێرانکردنی بەروبووم و خواردن.

(فیلیب برووس) لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئابووری ڤێرجینیا) دەگێڕێتەوە، کە تەنیا لە یەک هەڵکوتاندا سێ دۆنم (١٢,٦کیلۆمەتر) بەروبوومی وێران دەکرد، واتە: خواردنی چوار هەزار کەس بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو!

ئەمە کوشتنی پیرۆز بوو و سپیپێستە داماوەکان لە بەرامبەریدا دەستەوسان بوون. وەک پێغەمبەری ئازادی ئەمریکی (تۆماس جێفرسۆن) دەڵێت: "سەبارەت بەم کێوییانە ناچارین یان بیانکوژین، یان بیاننێرین بۆ لای ئاژەڵە کێوییەکانی دارستان".

# بە گۆشتی ڕەشپێستەکان[١٢] سەگەکەت تێربکە

بەدرێژایی نۆ ساڵ چالاکوانی مافەکانی مرۆڤ (جاک مۆرێل)، بەسەر بەڵگەنامە نهێنییەکانی داگیرکاریی فەڕەنسییەوە ڕەنج و ماندووبوونی کێشا، تا لە کۆتاییدا لە کتێبێکی زیاد لە دوو سەد لاپەڕەییدا پێشکەشی کردین بە ناونیشانی (ڕۆژژمێری تاوانەکانی فەڕەنسا لە جیهانی پشت دەریاکانەوە)، وەک لە ناونیشانەکەیدا دیارە، نووسەر لە داڕشتنی کتێبەکەیدا شێوەیەکی باشتری نەدۆزییەوە بۆ سەد تاوانەکەی فەڕەنسا وەک لە شێوەی ڕیزبەندیی ڕۆژژمێری.

لە هەموو مانگێکدا دەبینیت: لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا فلان ژمارە کوژراون!

لەوانەیە دیارترین ئەو ڕووداوانە تالانکردنی گوندی (سانسانی هاوسا)ی سەر بە نێجیریا بێت، لە دوای شکستیان بەرامبەر ئینگلتەرا لە کۆنترۆڵکردنی میسر و سوداندا، فەڕەنسا ڕووی وەرگێڕا بۆ چاد، نێردەکەیان نارد بە سەرکردایەتیی دوو سەرکردە

---

(١٢) بە عەرەبیی زنجی و ئینگلیزیی نیگەر وەک ئازناوێکە و بۆ کۆیلە ڕەشپێستەکان بەکار دەهات و ئێستایش یەکێک بیەوێت سووکایەتی بە ڕەشپێستێک بکات، ئەو وشەیە بەکار دەهێنێت، هەرچەندە کۆیلەکان تەنیا ڕەشپێست نەبوون، بەڵکو تا داگیرکاریی ئەوروپا بۆ ئەفریقا لە ڕووی ژمارەوە جیاوازییەکی وایان نەبوو. (وەرگێڕ).

(بـولی فـولی)، (جولیـان شـانوان) لە کـانوونی دووەمـی سـاڵی (١٨٩٩ی زایینـی)دا، لەپێنـاو دابینکردنـی پارەی ئەم نێردەدا، بەسەر هەر گوندێکـدا دەڕۆشـتن، تـالانکردن و سـووتاندن و دەسـتدرێژی و کوشـتن چارەنووسـی زۆریـنەی دانیشـتوانەکەی بـوو، تـا گەیشـتنە گونـدی سانسـانی هاوسـا، کە وەک ئـاژەڵ سـەربڕدران: بە پیـاو و ژنەوە، ئەوان و گوندەکەی دراوسێیشیان (کارما دونجا).

کوشـتنی بیسـت ژن بە منـاڵە سـاواکانیانەوە، یەکێـک بـوو لە دیمەنەکـانی ئەم قەسـابخانەیە، تـاکو ببـنە پەنـدێک بـۆ دانیشتوانەکانی دیکە.[١٣]

پاشـان جەزائیـر، کە باسـی تـاوانی داگیرکـاریی ناکرێت بەبـێ ناوهێنانی فەڕەنسا و ڕشتنی خوێنی ملیۆنێک مرۆڤی بێتـاوان. لە وتارێـک لە (غیسـتابوکوم)ی جەزائیریـدا، ڕۆژنـامەوانی فەڕەنسـی (کلۆد برودی) لە ساڵی (١٩٥٥ی زایینی)دا گەواهیی خۆی دەدات و دەڵێت:

"ئەشـکەنجە بە موگنـاتیس و فـووتێکردن بە ئـاو لە پاشـەوە و کارەبالێـدان لە پەردەی چڵمـین و بنبـاڵ و بڕبـڕەی پشـت، شـێوازی خوازراوی ئەشکەنجەدانە، چونکە کـاتێ بە پیشـەیی ئەنجام دەدرێت شوێنەواری ئاشکرا جێ ناهێڵێت".[١٤]

(13)P. Vigné d'Octon, La Gloire du sabre, Paris, Flammarion, 1900, p.40, 41, cité par Jean suret -Canal, Afrique Noire, Occidentale et Centrale, Éditions sociales, 1968, p. 299- 300 ; Muriel Mathieu, la Mission Afreque 1995, p. 103 -104.

(14)Pierre Vidal -Naquet, La Raison d'État, Les Éditions de minuit, 1962, page 58, 69, 93, 111, La découverte, 2002; Pierre Vidal - Naqute, La torture dans la république, Maspéro, 1983, page page 25;

لە جەزائیرەوە بۆ دۆمەنیکان لە دەریای کاریبی، ئاگری تووڕەیی لە بەرامبەر بڕیاری داگیرکاریی فەرەنسیدا هەڵسا، کاتێ بڕیاری گەڕاندنەوەی کۆیلایەتیی دا لە ساڵی (١٨٠٣ی زایینی)دا.

ئەم نامەیە بە نموونە وەربگرە:

(سەرکردە ڕامێلی خۆشەویست! سریەیەکی سەد و پەنجا کەسیم بۆ ناردوویت، بە سەرکردایەتیی بەڕێز باری، بیست و هەشت سەگ لە جۆری (بۆلدۆگ)یشیان لەگەڵدایە. با پێت بڵێم هیچ بودجەیەک بۆ خواردنی ئەم سەگانە دابین نەکراوە، بەڵکو دەبێت لە گۆشتی ڕەشپێستەکان تێریان بکەن.

لەگەڵ ڕێز و دۆستایەتیم بۆتان).

سەیر نییە، ئەم سەگانە لە هاڤانا لە کووباوە دەهێنران، کە داگیرکەری ئیسپانی ڕاهێنانی پێ دەکردن لەسەر هێرشکردنە سەر کۆیلە ڕەشپێستەکان![١٥]

با لە باسی ئیسپانییەکان و کۆیلەدا، ئەوەمان بەسەردا تێنەپەڕێت، کە ئیسپانییەکان یەکەم کەس بوون لە ساڵی (١٥١٨ی زایینی)دا دیلیان لە ئەفریقاوە ڕاگوێزا بۆ جیهانە نوێیە پێشکەوتووەکەیان لە ئەمریکا.[١٦]

Jean -Luc Einaudi, Pour, l'affaire Fernand Iveton, L'Harmattan, 1986, page 41; Gilles, Martinet, Torture, mémoire, Algérie, Le Monde, 30 novembere 2000.

(15) Victor Schoelcher, Vie de Toussaint Louvertrue, Ollendorf, 1899, Karthala, page 373.

(١٦) والترودیني: أوروبا والتخلف في امریکا.

بازرگانیکردن بە کۆیلەوە لە سەدەی حەڤدە لە ئەورووپادا بووە کارێکی یاسایی، شاژنێکی گەورەی وەک (ئیلیزابێتی یەکەم) داوای هاوبەشیکردنی قازانج لە بازرگان (جۆن هۆکێنز) دەکات - بەهۆی زۆری داهاتەکەیەوە - و هێمای خانەدانی پێ بەخشی، کە داوای لێ کرد لەسەر شێوەی ئەفریقییەکی زنجیرلەدەستکراو بۆی بنەخشێنێت!

لەم چوارچێوەدا فەیلەسووف و بیرمەندی فەرەنسی (ڕۆجێ گاروودی) دەڵێت: "بەهانەی ڕۆژئاوا بۆ دەستبردن بۆ جیهان، تالانکردنی سامانەکانی، سەرکوتکردنی ئازادییەکان بە شێوەی جۆراوجۆر؛ هەندێکی بەناوی سەرداریکردنی جیهان و هەندێکی تری بەناوی بڵاوکردنەوەی شارستانییەت لە جیهاندا، بەڵکو لە هەندێ کاتدا بیانووی بڵاوکردنەوەی مەسیحییەتیان دەهێنایەوە! لەژێر ئەم دروشمانە و هاوشێوەکانیان، ڕۆژئاوا جیهانی تالانکرد و هەندێ شارستانییەتیشی بە زۆرینەی خەڵکەکەیەوە لەناوبرد". (١٨)

ئەمە جیهانی ڕۆژئاوای پێشکەوتوو بوو و بیرمەندێکی فەرەنسی وەسفی دەکات، کە جیهانە نوێیەکەی باش دەناسێت:

"ئەو جیهانە یەکەمە پێشکەوتووەی، کە لەسەر لاشەی ملیۆنان بێتاوان لە سەرانسەری کیشوەرەکانی جیهانەوە دامەزرا، بە لاشەی شارستانییەت و سامانە بەتالانبراوەکانیانەوە!"

خەیاڵ بکە لەسەر ئاستی جیهاندا تەنیا بیست و دوو دەوڵەت لە داگیرکاریی بەریتانی ڕزگاریان بوو، ئیتر باسی فەرەنسا و ئەڵمانیا

---

(١٨) ڕۆجێ گاروودی: گۆڕهەڵکەنەکان.

و بەلجیکا و ئیسپانیا و پرتوگال و هۆڵەندا و ئیتالیا و جەمسەرەکانی دیکەی جیهان ناکەین، پاشان دێن و کوژراو و قوربانییەکانی دەستیان بە تیرۆریست تۆمەتبار دەکەن!

## فەڕەنسا و ئازادی..
## مێژووە ڕەشەکەی دەوڵەتە ڕووناکەکە!

زۆر جار (ئیمانوێل ماکرۆن) - سەرۆکە بچووکەکەی فەڕەنسا- بەرگری لە بەهاکانی کۆماری فەڕەنسی دەکات، ئەو بەهایانەی لە دروشمەکانی (شۆڕشی فەڕەنسییەوە) وەریگرتوون: ئازادی، یەکسانی، برایەتی!

بەڵام ماکرۆن ئاگای لە ئاکامی قسەکانی نییە بۆ سەر وڵاتەکەی، لە ئەنجامی وتارەکەی، نارەزایی لە سەرانسەری جیهان دژ بە سیاسەتەکانی فەڕەنسا لەگەڵ موسوڵمانان دەستی پێ کرد، بانگەوازی بایکۆتکردنی کاڵا فەڕەنسییەکان وەک ئاگری نێو پووش بڵاوبووەوە. وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسا بێدەنگ نەبوو، پەیامێکی ڕەقی بڵاوکردەوە - وەک ئەوەی داگیرگە کۆنەکانی بدوێنێت - داوای وەستانی ڕاستەوخۆی بایکۆتکردنی کاڵا فەڕەنسییەکانی لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرد، پەیامەکەی ماکرۆنی وەها وێنا دەکرد، وەك بڵێی بانگەشەی ئازادیی ویژدان و ئازادیی ڕادەربڕین و ئازادیی ئایینی دەکرد لە بەرامبەر گوتاری هاندان بۆ دوژمنایەتی!

باشە.. ئەمە لە ماوەی پێشوودا ڕوویداوە، بۆ ئێستایش وەرن بۆ گەشتێکی دوورتر، گەشتێک بۆ قووڵایی مێژوو.

لەم گەشتەدا، مێژووی تاریکی وڵاتی ڕووناکی و ئازادیی

ویـژدان و ئـایین و ڕادەربـڕین دەبینـین، گەشتەکەمان دابەش دەکەیـن بەسەر مانگەکانی سـاڵدا، لە کـانوونی دووەمەوە دەسـت پـێ دەکـات، تا دەگاتە کانوونی یەکەم.

لە هەر مانگێـک لە مانگەکـانی سـاڵدا، گەشـت دەکەیـن بـۆ شـوێنێکی نـوێ لە جوگرافیـای ئەم جیهـانە فـراوانەدا. هەمـوو ئەمە لەپێنـاو ئەوەی لە ڕاسـتیی دروشـمەکانی کۆمـاری فریشتەئاسـاکە، کە مـاکرۆن بەرگریـی لـێ دەکـات و باوبـاپیرانی پـێش خـۆی دایانمەزراندووە و پتەویان کردووە دڵنیابینەوە!

پـێش ئەوەی دەسـت بکەیـن بە گەشـتەکەمان، بیـری مـاکرۆنی دەخەیـــنەوە بەوەی هەمـــوو ئەو ڕووداوانەی باســـیان دەکەیـــن لە وڵاتگەلێکـــی موســـوڵماندا ڕوویانـــداوە، کە فەڕەنســـا جەیـــش و جاشەکانی بـۆ ناردوون. بەدڵنیـاییەوە ئەمە پێش سـەرهەڵدانی داعـش بوو لەسەر ئەم هەسارەیە، بە ماوەیەکی زۆر...

## یەنایەر/ کانوونی دووەم - (١٦٧٢ز) - گینیا

لەم مێـژووەدا فەرمـانێکی فەڕەنسـی دەرچـوو تێیـدا هـاتووە هەرکەسێک لە گینیـا کەسێک بکـات بە کۆیلە، پاداشتی سیانزە فرانکـی بـۆ دانـراوە. ئەم پاداشـتە لە سـەردەمی (لویسـی شـانزەدا) بەرزدەکرێتەوە، تا دەگاتە شەست فرانک.

تا ئەوەی تەنیا لە ساڵی (١٦٧٠ی زایینی) فەڕەنسییەکان سێ

هەزار کەسیان لە وڵاتی گینیای موسوڵمانەوە ڕاپێچی بازارەکانی کۆیلایەتی کردبوو!

لەم کاتانەدا بوو فەیلەسووفی سەدەی ڕۆشنگەریی فەرەنسی، (ڤولتێر)، لە باسی بازرگانی کۆیلەدا لە فەرەنسا دەیوت: "ئەم بازرگانانە لە هەمان کاتدا هەم چاکە دەکەن، هەم بازرگانییەکی قازانجداریش".

دەی با لە ماکرۆن بپرسین دەربارەی بەهاکانی کۆماری فەرەنسا بەرامبەر بە کۆیلەکردنی موسوڵمانەکان و بازرگانیکردن بە کۆیلەوە؟!

## فێبرایەر/ شوبات - (١٨٤٣ز) - جەزائیر

(لە بەیانیدا شۆڕبوومەوە بۆ (حەمیدە)، هەرچی بهاتبایەتە ڕێم دەمسووتاند. ئەو لادێ جوانەم خاپوور کرد. لاشەی بەیەکەوە لکاوی کەڵەکەبوو، کە خاوەنەکانیان شەو لە سەرماندا ڕەقیان بردبووەوە، باسی گەلی (بەنی مناسر) دەکەم. ئەمانە ئەوانەن لادێکانیانم لە بیست و پێنجی فێبرایەر سووتاند و لە پێش خۆمەوە ڕاپێچم کردن).

ئەم وشانەی سەرەوە لە دەمی (لویس لاموریسێر) جەنەراڵی کۆمەڵکوژییەکانی جەزائیر هاتە دەرەوە کاتێ باسی کارەکانی خۆی دەکرد، کە لە شارۆچکەی (حەمیدە)دا کردبوونی.

## مارس/ ئازار - (۱۸٤۳ز) - جەزائیر

(دەبێــت هەر یەکێــک لە دانیشــتوانەکان، کە مەرجەکانمــان قەبووڵ ناکات، لەناوببرێت. دەبێت هەموویان ببرێن و تاڵان بکرێن، بەبێ جیاوازیکردن لە تەمەن و ڕەگەزدا. سوپای فەرەنسی پێ بخاتە هەر شــوێنێکەوە، نابێــت شــینایی لــێ بڕوێــت، ئیتــر پــارێزەرانی مافەکانی مرۆڤ هەرچییەکیان وتبێت!

هەرچــی ئەو ســەربازانەیە، کە شــەرەفی ســەرکردایەتییانم پــێ دراوە، پێم وتــوون، خۆم بە زمــانی خۆم پێم وتــن هەرکەس عەرەبێــک بە زیندوویی بهێنێتەوە، چارەنووسی ملپەڕاندنی دەبێت بە شمشێر!

دەبێــت هەمــوو ئەو نێرانەی تەمەنیــان لە ســەروو پــانزە ساڵەوەیە بکوژرێن، ژن و منداڵەکانیان بکرێن بە کۆیلە!

**بە کورتی:** دەبێت هەمــوو ئەوانە بکــوژێن، کە بە زەلیلی وەکــو سەگ نایەنە ژێرپێمان).

ئەمەی ســەرەوە دەقــی نــامەیەکی جەنەڕاڵــی فەرەنســی (دو مۆنتانیــاک) بــوو بــۆ یەکێــک لە ســەرکردە فەرەنســییەکان، ئەو جەنەڕاڵەی بە وێــنەیەک بەناوبانــگ بــوو، کە کیشــابووی و تێیــدا چێژی لە سەربڕینی جەزائیرییەکان دەبینی!

ئەم سەربڕینە فەرەنسییە بە دڵنیاییەوە پێش ئەوە بوو داعش بێتە نێــو مێــژووەوە، دەکرێــت ئیمانوێــل مــاکرۆن ڕۆڵــی بەهــا فەرەنســییەکانمان پــێ بڵێــت بەرامــبەر ســەرەبڕینی دانیشــتوانە ڕەسەنەکانی وڵاتەکە؟!

## ئەپرێل/ نیسان - (١٩٤٧ز) - مەغریب

لەم مێژووەدا شەڕێکی دەستەویەخە لە نێوان کۆمەڵێک مەغریبی و فیرقەی سینیگالییەکانی سەر بە سوپای فەرەنسیدا ڕوویدا.

وەڵامی سەربازەکان قەسابخانەیەک بوو لە ڕۆژی شەممەوە دەستیپێکرد، تا کاتژمێر هەشتی بەیانیی ڕۆژی یەکشەممە نەوەستا، قوربانییەکانی گەیشتنە سەد و هەشتا کەسی مەغریبی بە ژن و منداڵەوە!

## مایۆ/ ئایار - (١٨٩٩ز) - نەیجەر

لەم مێژووەدا لیوای ئەفسەری فەرەنسی (فولی) و یاریدەدەرەکەی (شانوان)، گەیشتنە وڵاتی نەیجەری موسوڵمان و بە دیاریکراوی شارۆچکەی (بیرنی - نکونەی)، ئەو شارۆچکە بوو خەڵکەکەی ڕێژەی دانەوێڵەی داواکراویان لە لایەن فەرەنسییەکانەوە نەدابوو، کاتێک سوپای فەرەنسی گەیشتە شارۆچکەکە و پێش ئەوەی دەست بکات بە دزی و تالانی، ئاگری گوللەی بەردایە شارۆچکە هەزار و پێنج سەد کەسییەکە و نەوەستان، تا یەک بە یەکی دانیشتوانەکەیان لەناوبرد.

## یۆنیۆ/ حوزەیران - (١٨٥٦) - فەڕەنسا

ئەمجارە دوژمنایەتیی موسوڵمانان لە پاریسی دڵی خودی فەڕەنساوە هات.

لەم مێژووەدا فەیلەسووفی ئایینەکانی فەڕەنسی (ئیرنیست رینان) نامەیەکی نووسی و تێیدا سەرکۆنەی فەڕەنسییەکانی دەکرد لەسەر هاوسەرگیریکردن لەگەڵ گەلەکانی دیکەدا، لە نامەکەیدا دەڵێت: "چ تەعزێبارییەکە! کاتێ توخمە خانەدانەکان - واتە فەڕەنسییەکان - تێکەڵی خوێنی گەلێکی تر دەبێت، چونکە ئەمە یەکسانییەکی ڕیسواکەری هێناوە، یەکسانییەکی هاوشێوەی ئەوەی لە هەندێ وڵاتی ڕۆژهەڵات و چیندا هەیە".

نامەکەی رینان سەبارەت بە کتێبی (جیاوازی لە نێوان ڕەچەڵەکە مرۆییەکان)ی نووسەری فەڕەنسی (ئارسەر دو گوبینۆ)، کە تێیدا لافی ئەوە لێ دەدات ڕەچەڵەکی ئەورووپی پاکترینە و سەرداریی هەیە بەسەر تەواوی ڕەچەڵەکە ئاسیایی و ئەفریقییەکاندا.

ئەمە ئەو تیۆرییە بوو ئیستیعمار پشتی پێ بەست و کردییە بیانووی داگیرکردنی گەلە داگیرکراوەکان.

تیرۆرستی نیوزلەندا (برانتۆن تارنت) هەمان تیۆریای کردە سەرچاوەی ئەنجامدانی کۆمەڵکوژییەکەی لە ساڵی (٢٠٢٠ی زایینی)، کردییە پاساوی کوشتنی شەست موسوڵمانی ئاشتیخوازی دوور لە شەڕ، لە مزگەوتە چەپەکەکەیان لەوسەری جیهان!

ئـێمەیش لە لای خۆمـــانە لە مـــاکرۆن دەپرســـین دەربـــارەی هەڵقولانی ئەم بیرۆکانە لە دڵی پاریسەوە و لە ژێر دەستی یەکێک لەوانەی، کە بە بیـــردۆزدانەر و هاوبەشـــیکارە ســـەرەکییەکانی دامەزراندنی فیکری کۆماری سێیەم دادەنرێت!

## یۆلیۆ/ تەمموز – (١٠٩٩ز) – فەلەستین

ئەمجارە گوێ بۆ دەنگی پاپا (ئۆربانی دووەم) دەگرین، کاتێ لە کەنیسـەی (کلێرمۆنـت clermont)ی فەڕەنسـییەوە وتـار دەدات و سـەربازان هـان دەدات بـۆ دەرچـوون بەرەو جەنگـی خاچپەرسـتان. ئەوە قسـەکانی پاپا بـوون هەڵمەتێکی خاچپەرستانی لە فەڕەنساوە نـارد، کە تەنیـا لە مـاوەی دوو ڕۆژدا چـل هەزار موسـوڵمانی لە قـودس لەناوبرد.

بە هەمـــان شـــێوە جوولەکەکـــانیش بێـــبەش نەبـــوون، لە پەرستگەکانیاندا سووتێندران، لەم جەنـگە پیرۆزەی فەڕینسییەکاندا خوێن لە کۆڵانەکاندا گەیشتە ڕەشۆی ئەسپەکان!

## ئۆگۆستۆس/ ئاب – (١٩٥٥ز) – جەزائیر

(پۆڵ ئۆسارێس) ئەمە ناوی ئەو جەنەراڵەیە لە ساڵی (٢٠٠١ی زایینی)دا یادەوەرییەکانی لەبارەی جەنگی جەزائیرەوە نووسییەوە. ئەو یادەوەرییانەی سیاسییە فەڕەنسییەکانی تووشی شـەرمەزاری کـرد،

ئۆساریس ڕایگەیاند، کە فەرمانەکان یەکلاکراوە بوون بۆ لەناوبردنی بەرەی ڕزگاریی نیشتیمانی و ئەشکەنجە و کوشتنی نەیاران... هەموو ئەمە لەپێناو فەرەنسادا!

با (ئۆسارێس) لە یادەوەرییەکانییەوە باسی کۆمەڵێک بەهای فەرەنسیمان بۆ بکات، ئەو دەڵێت لە ٢٠ی ئۆگۆستۆس/ ئابی ساڵی (١٩٥٥ی زایینی):

(هەستام بە ڕیزکردنی دیلەکان، ئیتر موجاهیدە موسوڵمانەکان بن، یان ئەوانەی یارمەتییان دەدان، ناچارکرام فەرمانەکان بە دەستی خۆم جێبەجێ بکەم. دەبوایە بکوژرابان، ئەمە هەموو شتێک بوو، منیش ئەنجامم دا. تا ٢٥ی ئۆگۆستۆس/ ئاب پتر لە دوو هەزار جەزائیری بوونە قوربانی!)

## سێپتێمبەر/ ئەیلوول - (١٩٢٥ز) - سوریا

خێزانی (عیاش الحاج) لە (دێرەزوور)، داگیرکاریی فەرەنسییان بۆ شام قەبووڵ نەبوو، فەرەنسییەکان ئەمەیان لێ قەبووڵ نەکردن.

لە پانزەی سێپتێمبەر/ ئەیلوولی (١٩٢٥ز)دا فەرەنسییەکان کوڕەکەیان، وتە (محمود العیاش) و دوانزە شۆڕشگێڕی دیکەیان گولەباران کرد. لە هەمان ڕۆژدا (محمد العَیاش)ی سەر بە هەمان خێزان سزای بیست ساڵ زیندانیی بەسەردا سەپێنرا.

هەرچی دەربارەی بەڕێز (عیاش الحاج)ـە، فەرەنسییەکان لە

چاخـانەیەکی حەلەبـدا، کە بەردەوام سـەردانی ئەوێـی دەکـرد، ژەهرخواردیان کرد و ڕێگرییان کرد لەوە بچێتە نەخۆشخانە، تاکو لە کۆڵانەکانی حەلەبدا گیانی سپارد. بۆ زیاتر زەبوونکردنی خێزانی (العیـاش) ڕێگرییـان لە گواسـتنەوەی تەرمەکەی کـرد، تـا لەگەڵ خێزانەکەیدا لە دێرەزوور بنێژرێت لەبەر هۆکاری ئەمنی!

دەی ئایـا مـاکرۆن دەتوانێـت زیـاتر باسـی بەهاکـانی کۆمـاری فەرەنسیمان بۆ بکات؟!

## ئۆکتۆبەر/ تشرینی یەکەم - (١٧٩٨ز) - میسر

(لە ئۆکتـۆبەر/ تشـرینی یەکەمـی سـاڵی (١٧٨٩ی زایینـی)دا ئەسـپە فەرەنسـییەکان دەرگاکـانی ئەزهەریـان شـکاند و چـوونە نێـو حەرەمی زانکۆوە، سەربازەکان شمشێریان لە قوتـابی و مامۆسـتاکانی هەڵکێشـا، کتێبیـان تـاڵان کـرد و دەستنووسـی وایـان فەوتانـد، کە تەمەنـی چەنـدین سـەدە بـوو و لە ژێـر سـمی ئەسـپەکانیاندا پلیشـاندنیانەوە و لەناویـانبردن، مزگەوتـی ئەزهەریـان کـردە تەویـلەی ئەسـپ). وەک چـۆن ئوسـتاز (محەمـمەد جەلال کوشـک) لە کتێبەکەیدا (پاشان ئەسپەکان هاتنە نێو ئەزهەرەوە) باسی کردووە.

هەرچـی دەربـارەی مێژوونووسـی میسـری (عبـدالرحمن الجبروتـي)یە، کە هاوسـەردەمی شـاڵاوی فەرەنسـا بـوو بـۆ میسـر، کۆمەڵێک دیمەنی ئەم داستانەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "پاشان بە سواری ئەسپەوە هاتنە نێو زانکۆی ئەزهەرەوە و دۆلابی قوتابی و

مجێور و نووسەرانیان وردوخاش کرد، ئەوەی لە شتومەک دەستیان پێگەیشت تالانیان کرد، کتێب و قورئانەکانیان فڕێدانە سەر زەوی و بە نەعل و پێڵاوەکانیانەوە بەسەریاندا ڕۆیشتن، شەرابیان خواردەوە و قاپ و قاچاخەکانیان فڕێدا و شکاندیانن).

## نۆڤەمبەر/ تشرینی دووم - (١٩٥٤ز) - جەزائیر

جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە بۆ جەزائیر، کاتێ داگیرکاریی فەرەنسی پیسترین جۆری عەزابی دەرخوارددان؛ فەرەنسییەکان وەک هاووڵاتیی پلە دوو سەیری (دانیشتوانە ڕەسەنەکان)یان دەکرد، کەسانێکن مافی خواردن و خواردنەوە و ئازادییان نییە. لە نۆڤەمبەر/ تشرینی دووەمی (١٩٥٤ز)دا کۆمەڵێک لە جەزائیرییەکان داوای مافەکانی خۆیان کرد، سەرۆکی ناوخۆی ئەوکات - سەرۆکی کۆمار لە دواتردا- (فرانسوا میتران) وەڵامی دانەوە: "جەزائیر فەرەنسایە، فەرەنسایش تێیدا دان بە هیچ دەسەڵاتێکدا نانێت جگە دەسەڵاتی خۆی".

دوای ئەوە، فڕۆکە فەرەنسییەکان بەیاننامەیان خستە خوارەوە، کە تێیدا نووسرابوو: (ئەی موسوڵمانان! شوێن یاخیبووەکان مەکەون)، هەروەها هانیان دەدان بۆ خۆبەدەستەوەدان بۆ فەرەنسییەکان و ئەوەی، کە هیچ ئازارێکیان پێ ناگات، بەڵام کەس نەجووڵاوە، تاکو فەرەنسییەکان چوونە نێو شارەکانەوە و بە کردەی ئاگرهاوێژەکان کردیان بە وێرانە؛ خانووەکانیان سووتێنرا و

دانیشتوانەکانیش ڕایان کرد!

## دیسێمبەر/ کانوونی یەکەم - (١٩٥٢ز) - تونس

بۆ توونسی خۆشەویست.. داگیرکاریی فەرەنسی چاوی هەڵنەدەهات بە خەباتی تێکۆشەران لەپێناو سەربەخۆیی توونس لە دەستی فەرەنسا، شۆڕشگێڕی توونسی (فرحان حشاد) یەکێک بوو لەوانە، بەدڵنیاییەوە فەرەنسایەکی خاوەن گەورەترین مێژووی تاوانکاری لە ئەفریقا دەستەوەستان نابێت بەرامبەر حەشاد.

ڕێکخراوی (دەستی سوور) La Mainی Rouge تیرۆرستی سەر بە موخابەراتی فەرەنسیی ڕاسپارد بە کوشتنی حەشاد، تاکو ببێتە پەندێک بۆ ئەوانەی داوای سەربەخۆیی وڵاتەکەیان دەکەن لە فەرەنسای ڕۆشناییەکان!

ئەم گەشتە دوانزە ڕووداوییەمان هەڵبژارد بەدرێژایی مانگەکانی ساڵ، تاکو ماکرۆن بۆ هەر مانگێک بگەڕێتەوە دەورە درابێت بە تاوانی ئەو وڵاتەی بەرگری لە بەهاکانی دەکات!

دوانزە ڕووداو لە سەدان هەزار ڕووداوی ترسناک، کە کۆمارەکەی بەدرێژایی چەندین ساڵ ئەنجامی داون، ئایا ئەمە ئەو ڕۆشناییانەیە، کە بنچینەیان بۆ کۆماری فەرەنسا دانا و لەمەلاوە ماکرۆن بەرگرییان لێ دەکات؟!

یـان کـاتێ فەڕەنسـییەکان وڵاتـانی موسـوڵمانیان داگیـر کـرد کەسـانی تونـدڕەویان تێـدا بـوو، کە فەڕەنسـییەکان لەلای خۆیـانەوە چـوون بـۆ لەناوبردنیـان و بڵاوکـردنەوەی بەهاکـانی ڕۆشـنگەری فەڕەنسی؟!

ڕاسـتە وتویـانە: (هەمـوو دەردێـک دەرمـانێکی هەیە چـارەی بکات، گەمژەیی نەبێت کەسی نەدی چارەی بکات).

# گاڵتەجاڕی و پیرۆزی

(یەکەم هەنگـــاو لە ڕێــی مەعـــریفەدا ئەوەیە بـــوێر بیـــت لە ڕەخنەگرتن لە پیرۆزییەکان).

(ئیمانوێل کانت)

لە بەرەبەیانی حەوتـی یەنایەری (٢٠١٥ی زایینـی)دا پـاریس بە هەواڵـی هەڵکوتـانە سـەر بارەگـای ڕۆژنـامەی (شـارلی ئیبـدۆ) لە لایەن چەنـد چەکدارێکی دەمامکـدارەوە خەبەری بـووەوە، تەقەیـان لە کۆمەڵێـک فەرمـانبەری ڕۆژنـامەکە کردبـوو، یەکێکیـان هـاواری کردبوو: "تۆڵەی پێغەمبەر محەممەدمان کردەوە".

زۆربەمـان پێویسـتمان بەوە نیـیە هۆکـاری تەقەکردنەکەمـان پـێ بوترێـت، چـونکە کێشـەکە لەوە بەناوبـانگترە بشـاردرێتەوە، پـێش پەلامـارەکە بە چەنـد ڕۆژێکـی کەم، ڕۆژنـامەی شـارلی ئیبـدۆی کاریکـاتێری گـاڵتەخواز چەنـد وێنەیەکـی سـووکایەتیکردنیان بە پێغەمـبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێـت) بڵاوکردبـووەوە، وەک شەڕفرۆشتنێکی ئاشکرا بە ملیار و نیوێک موسوڵمانی سەر زەوی، هیچ شتێک لە لای موسوڵمانان لە ئایین و پێغەمبەرەکەیان پیرۆزتـر نییە، ئەمە ئەو شـتە بـوو کاریکاتێرسـتە بـێعەقڵەکە لێـی غافـڵ و بێئاگا بوو.

ئەم ڕووداوە لە دوای ڕووداوەکەی ڕۆژنامەی (یولاندس بۆستن)ی دانیمارکییەوە ڕوویدا، کاتێ لە سیپتێمبەری (٢٠٠٥ی زایینی)دا وێنەی هاوشێوەیان بڵاوکردەوە، زۆری پێنەچوو ڕۆژنامەی نەرویجی (Magazinet) و ڕۆژنامەی ئەڵمانی (دی فیلت) و ڕۆژنامەی فەڕەنسی (France Soir) و چەند ڕۆژنامەیەکی دیکەی ئەورووپا بڵاویانکردەوە.

وەک بەربەرەکانێیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەستی موسوڵمانان و پیرۆزییەکانیاندا، هەمان شت، کە پێش چەند ڕۆژێک دووبارەبووەوە لە لایەن مامۆستا فەڕەنسییەکە لەسەر هەمان ڕۆژنامەی ناوبانگ خراپ، واتە شارلی ئیبدۆ. ڕووداوەکە ئەوەندە ناوبانگی پەیدا کرد لە کەس شاراوە نییە، ئەم شتانە هانمان دەدەن بۆ پرسیارکردن: شتەکە تەنیا ورووژاندنێکی دەمارگیرانەیە، یان ڕووی پاشخانێکی ڕەگداکوتاوە لە فیکری ڕۆژئاواییدا؟ هەروەها ئایا ئازادی ڕادەربڕینی لافلێدراو بێسنوورە؟ تەنانەت ئەگەر ئەم ئازادییە سووکایەتی بە هەموو پیرۆزییەکان بکات و دان بە هیچ شتێکیشدا نەنێت لە سەرووی گاڵتەپێکردن و بەسووک تەماشاکردنەوە بێت؟!

کاتێ تاکە شتێکی پیرۆز ئەوەیە، کە (هیچ شتێک پیرۆز نییە)، ئەوکات هەموو شتەکان بێڕێزن، بە پشتبەستن بەمە هەستی شوێنکەوتوانی ناکەوێتە ژێر هیچ گرنگییەکەوە.

دەی با بپرسین: ڕووداوەکە لە کوێوە دەستی پێ کرد و چۆن گەیشتە ئێرە؟

# ئایینی مۆدێرنە

لەوانەیە ئاشنا بیت بە چیرۆکی بەناوبانگی ڕووخانی دەوڵەتی دینی لە ئەوروپا، بەتایبەت لە فەڕەنسا و شوێنگرتنەوەی لە لایەن دەوڵەتی مۆدێرنەی عەقڵانییەوە، کە لافی هەڵوەشاندنەوەی جادوو لە جیهان لێدەدا - بە دەربڕینی ماکس فیبەر- تاکو خودای مۆدێرنە لە خودای کەنیسە بباتەوە، ڕەسەنایەتی و بەهاداری تەنیا بۆ ئازادیی ڕەها بێت. ئەم چیرۆکە بەناوبانگە قۆناغی یەکەمی لەبندەرهێنانی بنچینە ڕەگداکوتاوەکانە.

ئایین، داب، ئینتیما و تێکۆشان: هەموویان بەهاگەلێکی بێسوودن لە جیهانێکدا، کە بەدەوری عەقڵ و ماددە و سەرمایەدا دەسوڕێتەوە، مۆدێرنە بەپێی پێناسەی (ئەلمەسیری) ئەو حاڵەتەی پێشخستنی یەک لە دوای یەکەیە، کە هەموو پێکهاتە ناوەکییەکانی مرۆڤی دەرهێنا و گۆڕیی بە مەرجەعییەت و بنچینەیەکی کۆنکرێتیی دەستکردی خۆی، کە تەنیا ماددە و عەقڵە، ئەمە بووە خودای نوێی جیهانی ڕۆژئاوای ئێستا و (مەسیحییەتی پێشوو).[١٩]

ئەم دەستاودەستکردنەی بنچینەکان زۆری پێ نەچوو و لەگەڵ کرانەوەی تەکنیکی و ڕۆشنبیری و میدیایی لە کۆتاییەکانی سەدەی پێشوودا دووبارە گۆڕا و کەلتووری سەرفکردن شوێنی

---

(١٩) المسيري: الحداثة المنفصلة عن القيمة.

گرتەوە و هەموو شتەکان بەهایان لەدەست دا و لە کۆتاییدا بەبێ پیرۆزی مانەوە. لە ئەنجامدا هەموو شتێک دوای بەکارهێنانی دەکرێت بگۆڕدرێت، بەم شێوەیە تۆکمەیی مۆدێرنە هەڵدەوەشێتەوە و مۆدێرنەیەکی تری شل جێی دەگرێتەوە!

لەم بارەوە مامۆستای مەغریبی بواری فەلسەفە، دکتۆر (الطیب بوعزة) دەڵێت: "ئەو بەخوداکردنەی لە فەلسەفەی مۆدێرنەدا درایە پاڵ عەقڵ، لە فەلسەفەی پاش مۆدێرنەیشدا دەیبینین، بەڵام ڕەهەندی دیکەی جگە لە عەقڵی بۆ زیاد کرا".[٢٠]

ڕێژەییەکان توغیانیان بەسەر ڕەهاکاندا کرد و باوەڕ بە هەموو بەهایەکی جێگیر ون بوو، بەم شێوەیە ئەوەی (زیگمۆند باومان) ناوینا "چاخی توانەوە و نادڵنیایی و ونیی مەرجەعییەت"، سەری هەڵدا.[٢١]

لە ڕەحمی ئەم بوونە مێژووییەدا گەورە کچی مۆدێرنە (عەلمانییەت) لەدایک بوو، کە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوان ئایین و خەڵک سەری هەڵدا، ناکۆکییەکی ئەوتۆ، کە لە جیهانی ئیسلامیماندا پێی ئاشنا نەبووین.

یەکێک لە پەیڕەوکردنە سیاسی و ئابوورییەکانی لە ژێر ناونیشانی (لیبراڵییەت) سەری هەڵدا.

(٢٠) الطیب بوعزة: الانسان بوصفه حیوانا.
(٢١) زیجموند باومان: الازمة الشائلة.

## بەهاکە سفرە

وەرزێکـــی دیـــکە لە مێـــژووی مرۆڤـــایەتی؛ ئەمە چیرۆکـــی جیهانێکی لیبراڵیی کراوەیە، لەپێناو پارە و پێشکەوتنی تەکنیکی و بەکارهێنـــان (ئیســـتیهلاک)دا تێدەکۆشـــێت، جیهانێـــک تێیـــدا کەنارخستنی ئایین دەگاتە تەنگترین ڕووبەری شیاو، ئایینێک، کە تەنیا لە دڵتدایە.

(لەمەولا ئایین پەیوەندیی بە کاروباری گشتییەوە نییە)، ئەمە ئەو دەســـتەواژە بـــوو فەڕەنســـا بە هێزێکـــی زۆرەوە بە یاســـای ساڵی (١٩٠٥ی زایینـــی) لەپێناویـــدا تێدەکۆشـــێت، ئەو یاســـایەی کڵێســـا بەتەواوەتـــی لە دەوڵەت جیادەکـــاتەوە، بەڵام ئەمە تـــاکە هۆکـــاری لەدەستدانی پیرۆزیی شتەکان نەبوو.

ڕۆشنبیری لیبراڵی - بەپێی دیدی الطیب بوعزة - تاکی لە هەمـــوو ڕاگرێکـــی بەهـــایی جـــگە لە قـــازانجی مـــاددی ئـــازاد کـــرد، ئەمەیـــش بـــووە هـــۆی لەدەســـتدانی هەمـــوو بنەڕەتێکـــی ئەخلاقـــی، کە ڕێگریی لێ دەکات.(٢٢)

ئەخـــلاق چیتـــر بەهـــایەکی بـــاڵا و پابەنـــدبوون نییـــە، بەڵکـــو بـــووە خـــاوەن بەهـــایەکی سفر، ئەم بەهـــایە هـــیچ ژمـــارەیەک وەرناگرێت بە بوونی دەســـتکەوتێکی مـــاددی نەبێت. بۆیە بـــوعزە دەڵێت: "دەکرێت بڵێـــین فەلســـەفەی ئەخلاقـــی لیبراڵـــی لە ناوەڕۆکـــدا نـــائەخلاقییە،

(٢٢) الطیب بوعزة: نقد اللبرالیة.

زیـادەڕەوی نـاکەین، ئەگەر بڵێـین هـیچ مەزهەبێکـی فەلسـەفی لە پێشوودا هێندەی لیبـراڵیزمی ئەخلاقـی سووک نەکردووە و بەهاکەی بە دراوی کاغەز دیاری بکات".

پاشـان بەسەرسـووڕمانەوە دەپرسـێت: "ئایـا هـیچ بەهـایەکی ئەخلاقـی دەمێنێـتەوە کاتێـک بە کیلـۆ دەکێشـرێت و بە دۆلار دەپێورێت؟!"

# دارِنینی پیرۆزی لە جیهان

بـۆ تێگەشـتن لە بەردەوام بە سـووک سـەیرکردنی پیـرۆزییە ئیسـلامییەکان لە لایەن ڕۆژئـاواوە، دەبێـت ئەم مـۆدێلە بە خـودی ڕوانـین و پەیـڕەوی خـۆی ببینیـت، کە دان بە هـیچ پیرۆزییەکـدا نانێت، جگە لە ئازادیی ڕەها، کە لیبراڵییەت سپۆنسەریی دەکات.

ئازادی چەقە، تاکە پیرۆزییەکە لە کۆمەڵەیەکی بێ پیرۆزیدا، ئەوە ئەو مانـایەیە فەیلەسـووف و بیرمەنـدی ئەمریکـی (ڕیچـارد رورتی) بەکاریهێنا بۆ وەسفکردنی نوێگەری لە جیهانی ڕۆژئاوایی و شارسـتانییەتە عەلمانییەتەکەیـدا و وتـی پـرۆژەی دارِنینـی پیرۆزییەکانە لە جیهانDesacralization Project.

واتـای ئەوەیە مـرۆڤ دان بنێـت بە پیرۆزنەبـوونی هـیچ شـتێکدا[(٢٣)]، ئەمە تێگەشـتنی ورد و تەواوە بـۆ عەلمـانییەتی ڕۆژئـاوایی، کە جیهـان بەرەو دارِنینـی پیـرۆزی دەبـات، ئەمە لە ئێسـتادا بەلێشـاوەوە لە پـرۆژەی فیکـری گەورەی (عەلمـانییەتی جـوزئی و عەلمـانییەتی گشـتی)دا دەبینـین. کە ئەلمەسـیری جیـاوازی لە نێـوان دوو جـۆری عیلمانییەتـدا دەکـات، یەکێکیـان جـوزئییە، تەنیـا گرنگـی بە جیـاکردنەوەی ئـایین لە دەوڵەت دەدات،

(٢٣) محمد جديري: الحداثة ومابعدة الحداثة في فلسفة ريدتشارد رورتي.

ئەمە ئەو عەلمانییەتەیە دەوڵەتی نوێی ڕۆژئاوایی لە سەرەتاوە دەستیدایە.

عەلمانییەتێکی تر، کە گشتییە، ئەوەی (رورتی) مەبەستییەتی، ڕوانینێکی گشتگیرە بۆ گەردوون، ئایین و پیرۆزییەکان تەنیا لە دەوڵەت جیاناکاتەوە، بەڵکو لە دەستپێکدا هەموو بەهایەکی مرۆڤایەتی و ئەخلاقی و ئایینی لە کایە گشتییەکانی ژیان دادەڕنێت، پاشان لە کۆتاییدا لە هەموو لایەنە تایبەتییەکانی ژیان دایدەڕنێت، تا دەگاتە ڕادەی بەتەواوەتی دارنینی پیرۆزی لە جیهان.

عەلمانییەتی گشتی بەم مانایەوە باوەڕی بە هیچ پێوەر، یان ڕەها و کوللیات (گشتییەکان) نییە، تەنیا باوەڕی بە ڕێژەی ڕەها هەیە، ئەم ڕێژەییە واتە: هیچ پیرۆزییەک نییە، چونکە جێگیرەکان تەنیا تەراویلکە بوون.

ئەمە ئەو ناپێوەرییەیە، کە ئەندێشەکردنی قەدەغەکراوەکان، یان زانینی چەمکی پیرۆزی لە مرۆڤ ون دەکات، تا وای لێ دێت هەموو شتێك ڕێی تێدەچیت بە سووك و کەم تەماشا بکرێت، مرۆڤ - بەپێی ئەم مۆدێلە - لە هەموو شت نزمترە!

- هەروەک بیکۆڤیچ دەڵێت - ئەگەر پیرۆزی بۆ لاشە هیچ مانایەکی نەبێت، لە کاتێکدا بۆ ڕۆح هەموو شتێکە، بۆیە لەدەستدانی ئەم پیرۆزییە چ بگات بە سووکایەتی و بێڕێزپێکردنی، هیچ مانایەکی دیکەی نییە جگە لە دابەزینی مرۆڤ بۆ ئاستێکی نزمتر لە ئاژەڵە کەڕ و لاڵەکان.

لەوانەیە لەم وشانەدا شتێک هەبێت ماکرۆن تێبگەیەنێت بۆچی موسوڵمانان کاتێک قسە بە پێغەمبەرەکەیان دەوترێت تووڕەبوونێک تووڕە دەبن زیاتر و توندترە لە تووڕەبوونیان لەپێناو خۆیشیاندا!

﴿۞إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ﴾ (الانفال: ٢٢) واتە: "بەڕاستی خراپترین زیندەوەران لای خوا ئەو کەسانەن، کە کەڕن (حەق نابیستن)، لاڵن (حەقبێژ نین)، ئەوانەی، کە ژێر نابن (بیروهۆشیان ناخەنە کار تێنافکرن و بیر و زەینیان قوفڵ داوە)".

# تیرۆری ڕۆژئاوایی..
# ئەفسانەی جەنگان دژی توندڕەویی ئایینی

لە نیـــوەڕۆی پێنجـــی یۆلیـــۆی ســـاڵی (٢٠٢٠ی زایینـــی)دا، فڕۆکەی (هیرەقل - ١٣٠) لە فڕۆکەخانەی جەزائیری نێودەوڵەتی نیشـــتەوە، کە لە فەڕەنســـای ئازادییەکـــانەوە بە بیســـت و حەوت کەلـــلەسەری مـــرۆڤەوە گەڕایەوە، بیســـت و حەوت کەلـــلەسەر لە کەللەسەری سەرکردەکانی بەرگریی نیشتیمانیی جەزائیری.

فەڕەنســـا گـــۆڕی بـــۆ هەڵنەکەنـــدن، تـــاکو لە وڵاتەکەیـــان بیاننێژێت، بەڵکو بڕیاری دەستبەرداربوونی تەرمەکانیانی دابوو، کە لە مۆزەخـــانەی مـــرۆڤ لە پـــاریس لە نـــاو کـــۆمەڵە ســـندووقێکی نماییشکردندا هەڵیگرتبوون.

ســـەد و حەفتـــا ســـاڵە، کەلـــلەسەری ئەم شـــەهیدانە لە ســـندووقدا نماییش کرابوون، ئەمانە نزیکی دوو سەدە، تەنانەت مـــافی ســـەرەتایی بەخاکسپاردنیان پێ ڕەوا نەبینرابوو!

بەڵام ئەوەنـــدە چانســـیان هەبـــوو، کە تەرمەکانیـــان بگەڕێتەوە، لە کاتێکدا هێشتا دوازدە کەللەسەری تری هاوڕێکانیان، لە هۆڵەکانی نماییشکردندا لە پاریس ماوەنەتەوە!

## مۆزەخانەی مرۆڤ

ئەم نماییشکردنە لە مۆزەخانەی مرۆڤ بووە لە پاریس، ئەو مۆزەخانەی هیچ دەربارەی مرۆڤ نازانێت، بەڵکو تەرم و کەللەسەری مرۆڤی تێدا نماییش دەکرێت، تا خەڵك و سەیرکەران لێی بڕوانن، هەریەک لە کەللەسەرەکان ژمارەیەکی هەیە، تەنیا ژمارەیەک!

ئەو مۆزەخانەیەی زانای ڕەچەڵەکەکان، (پۆل ڕیڤێر)، لە ساڵی (١٩٣٧ی زایینی)دا دایمەزراند، تاکو ببێتە ناوەندێکی لێکۆڵینەوە، بەڵام بوو بە شایەت لەسەر گەورەترین تاوانی ئیستیعماری لە مێژووی نوێدا. لە هەمان ئەم مۆزەخانەیەدا کەللەسەری (سلیمان الحلبي) دەبینین، لە ژێر ئێسک و پرووسکەکەیدا بە یەک وشە باسی کراوە و نووسراوە: تاوانبار! تەنیا لەبەر ئەوەی (کلیبەر)، جێگری (ناپلیۆن)ی کوشتووە لە سوپای ڕۆژهەڵات لە میسری، ئەو سوپایەی ئاگری لە دەشت بەردا و خەڵکی لە زێدی خۆیان وەدەردەنا و شکۆی پیرۆزییەکانیانی شکاند و سەری دوو هەزار و پێنج سەد هاووڵاتیی لە لەشیان جیا کردبووەوە و تەرمەکانیانی فڕێدایە نێو ڕووباری نیلەوە، تەنانەت ئافرەتانیش لە کوشتوبڕ و ئەشکەنجەدان بێبەش نەبوون.[٢٤]

دوای هەموو ئەمانە، دەبینین لە ژێر کەللەسەری (سلیمان

(٢٤) تاريخ الجبرتي: عجائب الآثار في تراجم و الاخبار.

الحلبي)دا نووسراوە: "تاوانبار!"

ڕێک هەمان ئەفسانەیە، کە تاوانی تاوانبار دەخاتە ملی قوربانییەکە..

ئەو ئەفسانەیەی، قوربانییەکە دەکاتە کوژراوێکی تیرۆرست و تاوانباریش بە پاڵەوانێکی شەهید..

هەمان ئەفسانەیە، کە کەللەسەری شۆڕشگێڕەکانی جەزائیری کرد بە سزای ڕێگرتن لە هەر کەسێك، کە ڕێ بە خۆی دەدا بەرهنگاری تاوانکاریی ڕۆژئاوایی ببێتەوە، کە چەندان دەیە لە سەردەمی ئیستیعماردا پەیڕەو دەکرا. ئایا بەڕاست ئەوە ئایینە توندڕەوی دروست دەکات؟ یان ئەوە وڵاتە مۆدێرنەکانی ڕۆژئاوان، دەستە پیسەکەیان بەوانی تردا دەسڕنەوە؟!

## ئەفسانەیەکی بەسوود

(ناتوانیت ئەفسانە بە لۆژیک و دروستی، یان بە هێزی بەڵگە ببەزێنیت، چونکە ئەفسانە هەر بە سروشت بێبنچینەیە، هەر بێبنچینەییە چەسپاو و دامەزراوی دەکات. پێنەگەیشتوویی و ساویلکەیی جیاکەرەوەی ئەفسانە نییە، بەڵکو توانای خۆدزینەوەیەتی لە ئامێرەکانی ساغکردنەوە).(٢٥)

(لیندا زیلی، مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی شیکاگۆ)

(25)LAND M. G. ZERILLI, Doing Without Knwoing: Feminism's Politics of the Ordinary https://shorturl.at/rUZ38

بەم بەڵگەهێنانەوەیە، مامۆسای لێکۆڵینەوە کاسۆلیکییەکان (ویلیام کاڤانۆ) لە زانکۆی (دی پۆل) دەست دەکات بە دوان دەربارەی ئەفسانەی توندوتیژیی ئایینی.[٢٦]

ئەو وای دەبینێت ڕۆژئاوا ئەفسانەیەکی هەیە، کە دەڵێت: "ئایین بەدرێژایی مێژوو لادانێکی بەرەو توندوتیژی و تیرۆر هەبووە"، دەشڵێت: "ئەم ئەفسانەیە هیچ بنەمایەکی زانستیی نییە، بینایەکی ئایدۆلۆژی نەبێت هیچی دیکە نییە؛ هەروەها هەموو سیفاتەکانی ئەفسانەی لەخۆگرتووە لە چەسپاوی و دامەزراوی و خۆ لە لێپرسینەوە بەگەورەترزانین".

(نۆم چۆمسکی) هەمان شت بە شێوەیەکی جیاواز پشتڕاست دەکاتەوە، کاتێ دەڵێت: "هاوولاتیی ئەوروپی هیچ دەربارەی تاوانەکانی ولاتەکەی لە سەردەمی ئیستیعماردا نازانێت، بەلام دڵنیایە لەوەی ئەم داگیرکراوانە تیرۆرستن و تیرۆرست بوون!"[٢٧]

وەک کاڤانۆ دەڵێت، هۆکاری ڕەواجی ئەم ئەفسانەیە خزمەتکردنی ئامانجێکی دیاریکراوی بەکارهێنەرەکانییەتی لە ڕۆژئاوا، لەسەر ئاستی ناوخۆیی یارمەتیدەری پەراوێزخستنی هەر وتارێکی ئایینییە، کە عەلمانییەتی دەوڵەت بێزار دەکات، هەروەها پاساوهێنەرەوەی ئەو کارڕایی (ئیجرائات)ـە توندوتیژانەی ڕۆژئاوایە، کە دژی جیهانی دەرەوەی ڕۆژئاوا پەیڕەوی دەکەن. لەگەڵ

(٢٦) وليام كافانو: أسطورة العنف الديني.

(٢٧) نعوم تشومسكي، واندريه فلجي: عن الإرهاب الغربي من هيروشيما الى حروب الطائرات المسيرة.

ئەوەیشـــدا، دروســـتکردنی ئەو خراپەکـــاریی شـــەڕەیە، کە دەبێـــت لەناوببردرێت، یـان وەک (بییـر کۆنیسـا) دەڵێـت: "دروسـتکردنی ئەو دوژمـنەی وای لـێ کـردین بە ویژدانێکـی ئاسـوودەوە بکـوژین"[٢٨]، ئەمە یارمەتیـدەری دروسـتکردنی خـاڵێکی کـوێرە لە بیرکـردنەوەی ڕۆژئـاوایی دەربـارەی ئەوەی، تـا چەنـد ڕۆژئاواییەکـان دەسـتیان لە توندوتیژیدا هەیە.[٢٩]

ئەم ئەفسـانەیە، تۆمەتبـارکردنێکی پێشـوەختی خەیاڵـدانە، بـۆ دوورخسـتنەوەی تۆمەتبارکردنە ئامـادە ڕاستەقینەکە، دەڵێت: "ئێمە تاوانبـــار نیـــین، چـــونکە بەرگـــری لە خۆمـــان دەکەیـــن دژی ئەو تاوانبارانە، ئاگاداری ئەوەبن لوورەی سەربازە هێرشبەرەکان دێتە سەر جێگەکانمان بۆ کوشتنی ژن و منداڵەکانمان، دەی با پەلە بکەیـن و دەست بدەینە چەک و هێرشبردن".

ئا بەم شێوەیە سروودی نیشتیمانیی فەڕەنسی، هاوولاتییـانی فێر دەکات!

هەر لەم بوارەدا کاڤانۆ دەڵێت: "ئەم ئایدۆلۆژیا و دامەزراوە بەنـاو عەلمانییـانە دەکرێـت لە هەمـان ئاسـتی زۆرداری و ناعەقلانییەتـدا بێت، ئەو سیفەتانەی بە نێوچاوی کۆمەڵگە ئاییندارەکانەوە لکاوە، خـۆی دژی خـۆی دەوەسـتێتەوە، کە ئـایین تۆمەتبـار دەکـات بە پیرۆزکردنـی توندوتیژی؛ سـەیری خـۆی دەکەیـت ئەم پیـرۆزییە لە ئایینەوە دەگوازێتەوە بۆ دەوڵەت، تاکو ببێتە پیرۆزییە نوێیەکە. دەڵێن

(٢٨) بییر کونیسا: صنع العدو.. أو کیف تقتل بضمیر مرتاح؟
(٢٩) کافانو: أسطورة العنف الدیني.

کۆمەڵگە ناعەلمانییەکان، بەتایبەت موسوڵمانەکان، هێشتا فێری جیاکردنەوەی شوێنەوارە مەترسیدارەکانی ئایین نەبوون، بۆیە توندوتیژییەکەیان ناعەقڵانی و دەمارگیرانەیە، بەڵام توندوتیژییە عەلمانییەکەی ئێمە توندوتیژییەکی عەقڵانییە هەوڵ بۆ ئاشتی دەدات، بەداخەوە توندوتیژییەکی پێویستە بۆ کۆنترۆڵکردنی توندوتیژییەکەی ئەوان، خۆمان بە ناچار دەزانین بیانتەقێنینەوە بۆ ئەوەی ببنە دیموکراتی!"(٣٠)

دەوڵەتی عەلمانی لە ڕۆژئاوا بەم شێوە لۆژیک دەبینێت و بەهانەی بۆ دەهێنێتەوە لای هاوولاتییانی، ئەو ئەفسانە بەسوودەیە لە ڕێیەوە شەرعییەت و ڕەوایەتیی بە کردەوە ئیستیعمارییەکانیی داوە و دەدات.

بەڵام بەهانەهێنانەوە بۆ کوشتنی کەسێکی بێتاوان شتێکە و وا لە کەسێک بکەیت کەسێکی بێتاوان بکوژێت شتێکی ترە. لە یەکەمدا هۆکارێکت دەوێت بۆ کوشتن، بەڵام لە دووەمدا دەبێت ئامادەیی کوشتنی تێدا ساز بکەیت، پێویستە لە ئاستی مرۆڤبوونی بێتە خوارەوە، دەکرێت وەک مێروویەک پێناسەی بکەیت.

ئا بەم شێوەیە دەکرێ ڕاستەوخۆ لەناوی ببەین!

---

(٣٠) سەرچاوەی پێشوو.

## خەڵک و (نا خەڵک)

لە یەکێک لە تاقیکردنەوە دەروونییەکاندا[٣١]، زانای دەروونناسی ئەمریکی (ئەلبێرت باندۆرا) کۆمەڵە تاکێکی هێنا: دادوەر و قسەکەر، پاشان قسەکەرەکانی بۆ سێ گرووپ جیاکردەوە: گرووپی زیرەکەکان، گرووپی ئاژەڵەکان، گرووپێکی دیکەی بێ پۆلێن. پاشان کۆمەڵێک کێشەی دا بە هەر یەک لە سێ کۆمەڵەکە، تاکو هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن و داوای لە دادوەرەکان کرد گوێ لە بەشداربوان بگرن کاتێ لەنێو کۆمەڵەکانیاندا خەریکی گفتوگۆن و چارەسەرەکانیان هەڵسەنگێنن، بەو مەرجەی هەر کۆمەڵەیەک لە کاتی پێدانی وەڵامی هەڵەدا بە تەزووی کارەبایی پلەکراو لە یەک، تا دە سزا بدرێن.

تاقیکردنەوەکە دەستی پێ کرد، وەک پێشبینی کرابوو، پۆلینکردنەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە ڕێژە و ئاستی ئەو تەزووە کارەباییانەی لە هەر کۆمەڵەیەک درا.

ئەو گرووپەی پێوانی ئاژەڵییان بۆ دانرابوو زۆرترین تەزووی کارەبابییان لێ درا (بە ژمارە و ڕێژەوە) بە بەراورد بە دوو گرووپەکەی دیکە، لە کاتێکدا گرووپی زیرەکەکان کەمترین تەزوویان بەرکەوتبوو.

(31) A. Bandora, and Others – Disinhibition of Aggression Through Diffusion of Responsibility and Dehumanization Victims .

ئەمە مانای ئەوەیە داماڵینی مرۆڤ لە مرۆڤبوونی بەسە بۆ بەهانەهێنانەوە بۆ قورسترین و نادادپەروەرانەترین سزاکان، دەروونناسی ئەمریکی، (فیلیپ زیمباردۆ)، ئەم لێکۆڵینەوەی زیاد کرد بۆ کتێبەکەی بە ناونیشانی (کاریگەریی شەیتان)، تاکو ڕوونی بکاتەوە چۆن مرۆڤێکی ئاسایی دەبێتە بکوژێکی خوێنرێژ.

لە کاتی دادگاییکردنی (خوێنرێژەکانی هوتۆ) لەسەر تاوانە خوێناوییەکانیان دژی هۆزەکانی (تۆتسی) لە کاتی شەڕی ناوخۆیی (ڕواندا)دا، کۆمەڵێک لە تاوانباران ئاماژەیان بۆ ئەوە دا، کە تۆتسییەکانیان لەبنەڕەتدا وەک مرۆڤ نەدەبینی، بەڵکو وەک مێروو و سیسرک دەیانبینین. ئا بەم شێوەیە سەرکردەکانیان باوەڕیان پێ هێنابوون، ئەمەیش لێدوانی یەکێک لە سەرکردە یابانییەکانە، دەربارەی کوشتنی دڕندانەی چینییەکان لە دووەم جەنگی جیهانیدا:

(کوشتنیان ئاسان بوو بۆ سەربازەکانمان، چونکە وەک شتومەك سەیرمان دەکردن، نەک وەکو مرۆڤ).[٣٢]

هەمان ڕوانینی جوولەکە نیشتەجێکراوەکانە بۆ فەلەستینییەکان، حکومەت گوند و داگیرگەکان بە تەلارسازییەکی ناوازە دروست دەکات و دۆڵە فەلەستینییەکانی دراوسێ دەکاتە زبڵدان و شوێنی ڕشتنی ئاوی زێراب و ئاودەستخانە. ئەم کارە بە شتومەککردنی بەرامبەرە، تاکو پەراوێزخستنیان ئاسان بێت.[٣٣]

یان بە دەربڕینی (جۆرج ئۆروێڵ): (خەڵک و ناخەڵک!)

---

(٣٢) فیلیب زیمباردو: تأثیر الشیطان.. کیف یتحول الاخیار إلی اشرار.

(٣٣) إیال وایزمان: أرض جوفاء.. الهندسة المعماریة للاحتلال الإسرائیلي.

وەک چۆمسکی دەڵێت: جیهان لای ڕۆژئاوا دابەش کراوە بۆ سەر ئەوانەی وەک خۆیانن و ئەوانەی وەک خۆیان نین، ناخەڵک ئەوانەی گرنگییەکیان نییە، گوێ لە لوورەی ڕۆژئاواییەکان بگرە دوای دووەم جەنگی جیهانی دەربارەی سووتاندنگە ئەڵمانییەکان و ئەوەی چۆن فەلسەفەی عەقلانیی ئەڵمانی فەلسەفەیەکی ئاشتیخواز بووە، تا ئەو ئابڕووچوونە ئابوورییەی لە دوای یەکەم جەنگی جیهانی تووشیان بوو!

ئەڵمانییەکان تاوانبارنەکران، تا ئەو کاتەی جوولەکەکانیان سووتاند، وەک ئەوەی قەلاچۆکردنی دانیشتوانی (ساموا) لە دەریای هێمن و هندییەکانی (ماپوچە) کردەیەکی ئاشتیخوازانەی ئەڵمانی بووبێت، یان ڕۆژئاواییەکان بیریان چووە ئەم قوربانییانەیش مرۆڤ بوون!

ئەڵمانییەکان تەنیا لە جەنگی (ماجی ماجی)دا لە تەنزانیا تەنیا سی ساڵ بەر لە هۆلۆکۆست، لە ڕێی پەیڕەوکردنی سیاسەتی زەویی سووتاوەوە هەزاران خەڵکیان بە برسێتی و ئازارەوە کوشت، ئەمە وێڕای هەموو قەسابخانە دڕندانانەکانیان بەرامبەر هۆزی (هێرێرۆ) لە نامیبیا لە سەرەتاکانی سەدەی ڕابردوودا.

ئەفسەرە ئەڵمانییەکان بەزۆر هاوسەری کوژراوەکانیان دەهێنا و ناچاریان دەکردن بە پارچە شووشە، گۆشتی کەللەسەری هاوژینەکانیان لێ بکەنەوە، ئەمە لەبەر چی بوو؟ بۆ ئەوەی

کەللەسەرەکانیان بە دەریادا ببەنەوە بۆ نیشتیمان و لێکۆڵەرانی نەژاد لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەن!(٣٤)

ئەمانە ناخەڵکن، تەنیا شتانێکن بۆ لەناوبردن..

(٣٤) باول شتارتسمان: ألمانيا وماضيها الاستعماري في إفريقيا. جرائم منسية.

# ئێستا دەکوژین

(بەلجیکییەکان زیاتر لە ڕێژەی ژمارەی دانیشتوانی خۆیان، ئەفریقییان کوشت).

(ئەندریێ فلجیک)

لە گفتوگۆیەکدا دەربارەی تاوانەکانی ئیستیعماری ڕۆژئاوایی..

ڕۆژنامەوان (ئەندریێ فلجیک) باسی کارە کۆنەکەی دەکات لەگەڵ ڕێکخراوێکی خێرخوازیدا بۆ لابردنی مین و بۆمبی نەتەقیو، دەڵێت دەزگاکە سکاڵای تۆمارکردووە، چونکە زۆرێک لەو کۆمپانیایانەی ئەم تەقەمەنییانە بەرهەم دەهێنن ڕەدی دەکەنەوە زانیاریی تەکنیکی لەسەر تەقەمەنییەکانیان بدەن. ئەمە هۆکارە بۆ ئاڵۆزبوونی هەڵوەشاندنەوەیان و هەموو ڕۆژێک ژیانی هەزاران کەس دەخاتە مەترسییەوە. (فلجک) دەڵێت: "ئەم بە سووک و ڕیسوا تەماشاکردنەی ژیانی گەلان، گوزارشت لە خۆیان دەکات، ڕێخۆشکەری کوشتنی هەزاران بێتاوانە".[٣٥]

ئەزانی بۆچی ئەم شایەتییە هەر بە گرنگی دەمێنێتەوە؟ چونکە

(٣٥) نعوم تشومسكي، واندريه فلجي: عن الإرهاب الغربي من هيروشيما الى حروب الطائرات المسيرة.

پێت دەڵێت هێشتا داگیرکاری و ئیستیعمار هەر ماوە.

بیروباوەڕەکانی هێشتا بەپێوەن، ئایدۆلۆژیا تیرۆرستانەکەی هێشتا زیندووە و لەملاولا هەناسە دەدات، ئیستیعماری ڕۆژئاوا تەنیا لە چەند دەیەیەکی سەدەی ڕابردوودا نزیکەی پەنجا ملیۆن مرۆڤی لەناوبرد، هەموویشی لە ژێر ناونیشانی بریقەداردا، کە ڕەوایەتی بە توندوتیژی دەدەن، وەک باسمان کرد توندوتیژیی عەلمانی، عەقڵانی و ڕێکخراوە.[٣٦]

## لە بەدبەختییەوە، پێشبڕکێیەکی باش هەیە بۆ هەڵبژاردنی تۆقێنەرترین تاوانەکانی ڕۆژئاوا!

ئایا لە (کۆلۆمبۆسەوە) دەست پێ بکەین، کە وەختێک پێی خستە نێو دوو ئەمریکاکەوە لە ساڵی (١٤٩٢ی زایینی)دا زیاد لە سەد ملیۆن دانیشتووی ڕەسەنی تێدا بەدی کرد، کە خاوەنی شارستانییەت و ڕۆشنبیری و شاری ئاوەدان بوون، بەڵام زۆری پێ نەچوو لە چەند ساڵێکی کەمدا نزیکەی ٩٥ ملیۆنیان لەناوچوو!؟[٣٧]

یان لە بارە پڕ لە کۆیلەکانەوە، کە لە ئەفریقاوە بەرەو دوورگەکانی هیند لە ساڵی (١٥١٨ی زایینی)دا لە ڕێی کەشتییەکانی ئیسپانیاوە ڕاگوێزران، کە بۆ بازرگانیی کۆیلەکانی

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو.

(٣٧) سەرچاوەی پێشوو.

ئەفریقیا دروستکرابوون؟![٣٨]

یان باسی سەد و سی و دوو ساڵ لە کوشتاری فەڕەنسا لە جەزائیری خاوەن یەک ملیۆن شەهید بکەین؟!

لەوانەیە بە هەموو ئەمانە ئاشنا بیت، بەڵام ئایا دەزانیت چیرۆککگەلێک هەن هەمان ناوبانگیان نییە؟

با سەدە و نیوێک بە کاتدا بگەڕێینە دواوە، بەدیاریکراوی بۆ کۆنگرەی بەرلین لە ساڵی (١٨٨٤ی زایینی)دا، دەبینین کۆمەڵێک دەوڵەتی ئیستیعماری، زەویی ئەفریقا لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکەن؛ با کۆنگۆ بە نموونە وەربگرین، کە پشکی یەکێک لە دڕندەترین تاوانبارەکانی جەنگ بوو لە مێژوودا: (پاشا لیۆپۆڵدی دووەم)، پاشای بەلجیکا، کە لە ساڵی (١٩٠٦ی زایینی)دا کۆنگۆی وەک یەکێک لە داگیرگەکانی بەلجیکا ناساند، پاشان وڵاتەکەی دوای شانزە ساڵ وەک دەستکەوتی جەنگ هەریەک لە (ڕواندا) و (برۆندی)ی لە ئەڵمانیای دۆڕاو سەندەوە و خستییە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لیۆپۆڵد کاتی بەفیڕۆ نەدا، زوو دەستی کرد بە مژینی سامانی وڵاتەکە، ئینجا چەند سریەیەکی جاشی لە ژێر سەرپەرشتیی زابتی بەلجیکیدا لە کۆنگۆلییەکان پێکهێنا بۆ کوشتوبڕ و تۆقاندن و دەستبەسەرکردنی دانیشتوانەکەی، لەپێناو ناچارکردنیان بۆ دەرهێنانی لاستیک.[٣٩]

گێڕانەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە لاستیک بە گیانی

(٣٨) والتر رودیني: أوروبا والتخلف في إفريقيا.
(39)Can't Blame Colonialism for Current Rapes in Congo https://shorturl.at/KqtT6 .

کۆیلەکانەوە لە دانیشتوانە ڕەسەنەکان دەلکێنرا، تا وشک دەبووەوە، پاشان بەزەبرەوە لێدەکرایەوە، تا گۆشتی ئەو داماوە بەکۆیلەکراوانەی لێ دەکردەوە؛ ئەوەیشی ئەمەی ڕەت بکردایەتەوە، کوشتن و ئەشکەنجە چاوەڕێی بوو، ئەنجام لە هەردوو حاڵەتەکەدا یەک شت بوو، ئەمە سەرباری دەستدرێژیکردن و کوشتنی هاوسەر و کچەکانیان.

ئەوەیشی تەمبەڵی بکات لە پێدانی ڕێژەی داواکراو، ئەوا دەستی خۆی یان کوڕەکەی دەبڕدرێتەوە و پاشان وەک سزا دەکوژرێت.

ڕۆژنامەوانێکی بەلجیکی دەڵێت لە ساڵی هەزار و هەشت سەد و نەوەد و شەش (١٨٩٦ز)دا، هەزار و سێ سەد دەستبڕینەوەی لە یەک ڕۆژدا ژماردووە.[٤٠]

بەم وەحشیگەرییە، گوندەکانی کۆنگۆ یەک لە دوای یەک لەناوبران، پیاوەکان ناچارکران دەستدرێژی بکەنە سەر دایک و خوشکی خۆیان، تەنانەت پێش ئەوەی بکوژرێن، دەستدرێژی دەکرێتە سەر دایکەکە و لاشەکەی دەسووتێنرێت و کچە پێنج ساڵانەکەیشی بەختی باشتر نابێت و هەردوو دەست و قاچی دەبڕنەوە!

بۆچی؟! چونکە باوکەکە ڕادەی لاستیکە داواکراوەکەی نەهێنابوو..

---

(40)Assumain Budgwa, Noirs-Blancs, Métis – La Belgique et la segregation does Métis du Congo bulge et Ruanda-Burundi-1908) .(1960

تـا ئەوەی لە مـاوەی چـل سـاڵدا کۆنگـۆ دە ملیـۆن مرۆڤـی بێتـاوانی لە (ناخەڵـک) لەدەسـت دا، بەڵام دەی کێشـە نیـیە خـۆ سـەرۆکی حکـومەتی بەلجیکـا (شـارل میشـێل) دوای سـەدەیەک داوای لێبوردنی کرد.[٤١]

بەڵام کـێ داوای لێبـوردن لە شـەش ملیـۆن منـداڵ دەکـات، کە هەمـوو سـاڵێک دەمـرن بەهـۆی نەبـوونی خزمەتگـوزاریی پزیـکـی لە وڵاتە ئەفریقییە هەژار و مافپێشێلکراوەکاندا؟!

ئـێ باشـە کـێ داوای لێبـوردن دەکـات لە شـەڕی پێـنج ملیـۆن کـوژراو لە سـەر دەسـتی ئەو میلیشـیایانەی لە لایەن کۆمپانیـا فرەڕەگەزەکـانەوە پـارەی بـۆ دابـین دەکرێت لەپێنـاو مژینـی سـامانە سرووشـتییەکان؟! دەی باشـە کـێ داوای لێبـوردن لە ڤێتنامییەکـان و چەندان نەوەی شێوێنراو دەکات بەهـۆی شـەڕی ئەمریـکـا و جەنگـی کیمیـاوی بـۆ سـەر وڵاتەکەیـان؟! کـێ داوای لێبـوردن لە ملیۆنـان کـــوژراو لە کەمبۆدیـــا دەکـــات، کە هەمـــان دەســـتدرێژیکار کوشتنی؟![٤٢]

کـێ داوای لێبـوردن لە دوانزە کەلـلەسەر دەکات، کە هێشـتا لە (مۆزەخـانەی مـرۆڤ) لە پـاریس نمـاییش دەکـرێن و چـاوەڕێی یەکێکن وەک هاوڕێکانی پێشوویان لە ژێر خاکدا بیانشارنەوە؟!

ئەمە مشـتێک بـوو لە خەروارێـک.. نـا، مشـتێک بـوو لە

(41)Belgium Apologizes of Kidnaping Children from African Colonies https://shorturl.at/qtx68.

(٤٢) نعوم تشومسكي، واندريه فلجي: عن الإرهاب الغربي من هيروشيما الى حروب الطائرات المسيرة.

مشتێک... ئەگینا نە قسە تەواو دەبێت و نە کات بەش دەکات بۆ باسکردنی ئەوەی تیرۆری ڕۆژئاوایی بە گەلە داماوەکانی دونیایان کردووە، یان ئەوەی عەلمانییەتی ڕۆشنگەر بە ناوی دژایەتیی ئایینەوە کردوویەتی. بیری چووە، یان لە بیری خۆی بردووەتەوە، کە بینای ئایینێکی نوێی بۆ خۆی کردووە لەپێناویدا بەبێ پێوان دەکوژێت، ئایینێک کتێبە پیرۆزەکەی وەرەقەیەکی سەوزی چاپکراوە، کە هەموان ئاشنان پێی!

## ئازادی ڕادەربڕینی فەڕەنسیی مەرجدار

(لە یاسا و بنەما و مافی ئێمەدا ئازادی بۆ هەموو تاکێک دابینکراوە).

ماکرۆن - سەرۆکە بچووکەکەی فەڕەنسا - لە کۆتا چاوپێکەوتنیدا بەو وشانەی سەرەوە بۆ جیهان دوا، ئەمە دوای ئەو پەرچەکردارەی جیهانی ئیسلامی بەخۆیەوە بینیی، کە سەرزەنشتی هەڵوێستی فەڕەنسای کرد بەرامبەر پێغەمبەری ئیسلام (درورودی خوای لەسەر بێت). ماکرۆن داوای لێبوردنی نەکرد، بەڵکو وتی قسەکانی لە سیاقی خۆی دەرکراوە، پاشان بەرگی سیاسیی داکەند و بەرگی فەیلەسووفی لەبەرکرد و ڕایگەیاند وڵاتەکەی جیاوازی لە نێوان ئایینێک و ئایینێکی دیکەدا ناکات و جیاوازی لە نێوان فیکرێک و یەکێکی دیکە و تەنانەت گاڵتەجاڕییەک و یەکێکی دیکە ناکات!

ولاّتەکەیشی دەستی گرتووە بەو بەها ئازادییانەی بەرزی کردوونەتەوە، پاشان - وەک ئەوەی یەکێک بێت لە فەیلەسووفە ڕۆشنگەرەکان — قسەی کرد و وتی ئەم بەهایانە میراتی فەڕەنسان، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە تۆماری کردوون. خۆ پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دڵی پاریسەوە ڕووناکیی ڕۆژی بینی، ماددەی نۆزدە دەڵێت:

(هەموو تاکێک مافی ڕا و دەربڕینی هەیە، ئەمەیش مافی ئازادیی باوەڕهێنان لەخۆدەگرێت بەبێ زۆرلێکردن؛ هەروەها ئازادیی داواکردن و وەرگرتن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و فکرەکانی هەیە، بە هەر ئامرازێک بێت بەبێ گوێدانە سنووری جوگرافی).

کەوایە - بەپێی قسەکانی خودی ماکرۆن - بەهاکانی کۆماری فەڕەنسی هیچ شتێك لە سەروو ڕەخنەگرتنەوە ناهێڵێتەوە و ئازادیی ڕادەربڕین بێسنوور و ڕەها دەکات بەرامبەر هەموو بابەتێک، هیچ دەنگێک بەرزتر نابێت لە دەنگی وشە، ئەگەر لەسەر حسابی گاڵتەکردن بە ئایین و پێغەمبەران، یان دۆزە دادپەروەرەکان؛ یان تەنانەت خودی خودایش بێت!

دەی با ئێستا ڕاستی ئەم لافلێدانە فەڕەنسییە بخەینە ژێر نەشتەری واقیعەوە.

## ئازادییەکـــانی فەڕەنســـا.. لە نێـــوان واقیـــع و خەونەکانی ماکرۆندا

لە ساڵی (٢٠١١ی زایینی)دا پەرلەمانی فەڕەنسی بڕیارێکی دەرکـرد، کە داننەنـان بە کۆمەڵکـوژیی ئەرمەنەکـان لە لایەن موسـوڵمانانەوە، تـاوانێکە و بە زینـدانی بـۆ مـاوەی سـاڵێک سـزا دەدرێت لەگەڵ غەرامەی چل و پێنج هەزار یۆرۆ!

باشـە ئـێمە لە مـاکرۆن دەپرسـین، بەپێـی بەهـا فەڕەنسـییەکان، مێژوونووسـێک چـۆن لەگەڵ ئەم هەمـوو گوشـارەی زینـدانیکردن دەتوانێـت بێلایەنـانە لێکـۆڵینەوە بکـات لە ڕووداوێکـی مێژوویـیدا و ڕایەکی جیای لە ڕای فەڕەنسای هەبێت؟!

هەروەها فەڕەنسا یاسایەکی هەیە، کە باسکردنی هۆلۆکۆست بە تـاوان هەژمـار دەکـات، ئەوەی گومـانی لە ژمارەکـانی هۆلۆکۆسـت هەبێت، یـان گومـانی لەو ئەفسـانانە هەبێت قەوارەی زایۆنییان لەسەر بیناکراوە - ئەگەر باوەڕی بە هۆلۆکۆستیش هەبێت — ئەوە دژایەتیـی سـامییەتە (معـاداة السـامية) و بەنـد دەکرێـت. بەڵێ، لە ژێر ئالآی بەها فەڕەنسییەکاندا نە لێکۆڵینەوەی مێژوویی بەهای هەیە و نە ئازادیی ڕادەربڕین!

ئەمە ئەو تـۆمەتە بـوو ڕووبەڕووی بیرمەنـدی فەڕەنسـی (ڕۆبێـر فۆریسـۆن) کـرایەوە لە سـاڵی (٢٠٠٦ی زایینـی)دا دوای ئەوەی

ڕەخنەی لە گێڕانەوەی مێژوویی ڕەسمیی هۆلۆکۆست گرت، وەزیری دەرەوەی فەڕەنسای ئەوکات ڕایگەیاندا وڵاتەکەی بەدوایەوە دەبێت، تا لە کۆتاییدا ناوی لە زانکۆدا سڕایەوە!

هەر هەمان تۆمەتە، کە ڕووبەڕووی یەکێک لە گەورەترین بیرمەندەکانی سەدەی ڕابردووی فەڕەنسا (ڕۆجێ گارۆودی) کرایەوە پێش ئەوەی موسوڵمانبوونی خۆی ڕابگەیەنێت؛ لە ساڵی (١٩٨٢ی زایینی)دا گارۆودی ئیدانەی کۆمەڵکوژیی زایۆنییەکانی کرد بۆ سەر (سەبرا و شەتیلا) لە لوبنان، هەر ئەوەیش وای کرد ببێتە نێچیری ڕێکخراوە زایۆنییەکان، لە میوانێکی هەمیشەیی تەلەفزیۆنەکانەوە بوو بە نەویستراوێک لە ڕۆژنامە فەڕەنسییەکاندا، دوای ئەوەی تۆمەتبار و زیندانی کرا بەهۆی گومانکردن لە ژمارەی قوربانییانی هۆلۆکۆست لە کتێبەکەیدا "الأساطير المؤسسة لدولة إسرائيل". هەرچەندە دانی بە هۆلۆکۆستدا نا، بەڵام وتی جوولەکە تاکە قوربانی نازییەکان نەبوون، بەڵکو گەلانی تریشیان کۆمەڵکوژ دەکرد!

لەم دواییانەدا بابەتەکە بۆ زیاتر لە هۆلۆکۆست سەری کێشاوە، وای لێ هاتووە هەر قسەیەک ڕەخنە لە زایۆنییەکان دەگرێت دەبێت بوەستێنرێت، ئەگینا قسەکەر تووشی زیندانی و غەرامەکردن دەبێتەوە!

هەر ماکرۆن خۆی بوو ئاماژەی پێدا، کە وڵاتەکەی لە دەقە یاساییەکانیدا پێناسەیەکی نوێ بۆ دژایەتیی سامییەت دەکات،

تـاکو دژایەتیـی زایـۆنییەتیش لەخۆبگرێـت. ئایـا بەهـای ئـازادیی فەڕەنســی لە بەرامــبەر ئـــازادیی ڕادەربـــڕین و ڕەخنەگـــرتن لە زایۆنییەکان لەکوێیە؟!

بەپێی یاسای سزا (قانوونی عقوبات)ی فەڕەنسی، هەرکەسێک سووکایەتی بە سروودی نیستیمانیی فەڕەنسی، یان ئاڵای فەڕەنسا بکات، بە حەوت هەزار و پێنج سەد یۆرۆ و شەش مانگ زینـدانی سزا دەدرێت. ئێ باشە بۆچی ئازادی ڕادەربڕین ئاڵای فەڕەنسا ناگرێتەوە، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام دەگرێتەوە؟!

تەنـانەت خـودی ڕۆژنـامە بێئـابڕووەکە (شـارلی ئیبـدۆ)، کە ماکرۆن ڕایگەیاند ئازادیی ڕادەربڕین مافی سووکایەتی بە هەمـوو ئایینەکـان دابـین دەکـات، نەک تەنیـا سـووکایەتی بە ئیسـلام. لەم بارەیەوە وێنەکێش (مـۆریس سینێ) تـوویتێکی بڵاوکـردەوە و تێیـدا دەڵێت: "من شارلی نیم، من سینێم، چەندین ساڵ وەک نیگـارکێش لە ڕۆژنـامەی شـارلیدا کـارم دەکـرد، لە سـاڵی (٢٠٠٩ی زایینـی)دا کاریکـاتێرێکم لە بارەی کوڕەکەی (نیکـۆلا سـارکۆزی)یەوە کێشا ئامـاژەی بە بـوونی بە جـوولەکە دەکـرد لەپێنـاو پـارەدا، ڕۆژنـامەی شـارلی داوای لـێ کـردم داوای لێبـوردن بـکەم، پـاش ئەوەی ڕەدم کردەوە، بە تۆمەتی ڕابواردن بە یەهودییەتەوە دەریانکردم".

ئەو پرســیارەی ئاڕاســتەی ســەرۆکی فەڕەنســای دەکەیــنەوە: بـۆچی فەڕەنســا لەم کەیســەدا ئازادییەکــان ســنووردار دەکــات و دەیکاتە (تابوو)یەک، کە ناکرێت دەستی لێ بدرێت، نابێت ئـازادی ڕادەربڕین دەستی بۆ ببات و لێی نزیـک ببێتەوە، پاشان ڕەخنە لە

موسوڵمانەکان دەگرێت بەوەی، کە دەستبردن بۆ پیرۆزترین شتیان - کە پێغەمبەرەکەیانە (دروودی خوای لەسەر بێت) - قەدەغە دەکەن و دەڵێت سنووردارکردنی ئازادیی ڕادەربڕینە؟!

## فەڕەنسای ئازادییەکان و ئیسلامۆفۆبیا

کەواتە بابەتەکە پەیوەندیی بە ئازادیی ڕادەربڕینەوە نییە، بەڵکو پەیوەستە بەو مۆدێلەی بەهاوە، کە ڕۆژئاوا دوای چاخی مۆدێرنە پەیڕەوی دەکات و لەسەر ڕەتکردنەوەی هەموو ڕۆڵێك بۆ پیرۆزی و موقەددەس لە ژیانی گشتیدا بنیاتنراوە و تێیدا بەها بتپەرستییە ئەورووپییەکە شوێنی ئایینەکانی گرتووەتەوە!

هەروەها بەکارهێنانی وەکو گوشارێکی سیاسی لێرەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە ڕەواجپەیداکردنی ڕاستڕەوە توندڕەوەکان لە ئەورووپا و بڵاوبوونەوەی تۆقینی ئیسلامۆفۆبیا.

جیاوازییەک هەیە لە نێوان ڕەخنەگرتن لە ئایینێکی دیاریکراو و خستنەژێر گفتوگۆ و پرسیارکردنەوە وەک ئەوەی لە یەکەکانی بەراوردی ئایینەکان لە زانکۆکانی ڕۆژئاوادا ڕوودەدات، یان لە کتێبی لێکۆڵینەوە و فیکری و تەنانەت میدیاییەکاندا ئەنجام دەدرێت، لەنێویاندا ڕەخنەگرتنی ژمارەیەك ڕۆژهەڵاتناس و مولحیدەکانە. ئەمە جیاوازە لەگەڵ سووکایەتیکردن بەو ئایینە لە ڕێی جنێو و گاڵتەکردن بە کەسایەتی و شوێنکەوتوانی، ئیتر ئەو سووکایەتییە بە زمان بێت، یان بە نووسین و وێنە.

وەک چۆن جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان ڕەخنەگرتن لە سەرۆکی دەوڵەتێک و سیاسەتەکانی و ئەنجامی بەڵێنەکانی هەڵبژاردنی، لەگەڵ سووکایەتی و گاڵتەپێکردنی - ئەو نموونەیەی ماکرۆن لە قسەکانیدا نموونەی پێ هێنایەوە -، ئەمانە زۆر جیاوازن لە گاڵتەکردن بە پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران. ماکرۆن لە بەراوردەکەیدا بیری چووە لە ڕیزی پێغەمبەراندا نییە، تاکو لە سەرووی ڕەخنەوە بێت!

جارێکی دیکە هەمان پرسیار: بۆچی ماکرۆن بەرجەستەکردنی ڕەمزێکی پیرۆزی ئایینیی لە ڕێگەی وشەگەلێکی قێزەون، یان وێنەگەلێکی سووکایەتیئامێز بە ئازادیی ڕادەربڕین دادەنێت، بەڵام لە بەرامبەردا گومانکردن لە کۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکان، یان هۆلۆکۆست، یان ڕەخنەگرتن لە بنەماکانی کۆمار بە تاوان دادەنێت و لەنێو ئازادیی ڕادەربڕیندا جێی نابێتەوە و بە هێزی ئاگر و ئاسن بێدەنگ دەکرێت؟!

دەی ئایا پاراستنی جەنابی پێغەمبەری میهرەبانی (درورودی خوای لەسەر بێت) لە لای دوو ملیار موسڵمان ئەولاتر نییە لە پاراستنی ئاڵا و دەوڵەت و بەها فەرەنسییەکان و ئەفسانەی بیناکەری دەوڵەتی زایۆنی؟!

پاشان بۆچی فەرەنسا لە سەرەتای (٢٠٢٠ز)دا زیاد لە حەفتا و سێ مزگەوت و ڕێکخراوی ئیسلامیی داخستووە؟!

دەی با بپرسین ئایا پشتگیری فەرەنسا لە گوتاری ئیسلامۆفۆبیا و هاندان بۆ ڕقلێبوونەوە لە موسڵمانان، جۆرێکە لە

جۆرەکانی ئازادیی ڕادەربڕین؟!

ئەی چی دەربارەی بەرتەسککردنی ئازادی لەچکبەسەرەکان لە قوتابخانە و زانکۆکاندا؟!

ئەی بۆچی کاتێ دوو کچی لەچکبەسەر لە ژێر بورجی ئیڤلدا بەر چەقۆی ڕەگەزپەرستی دران و کوژران، ڕاگەیاندنی فەڕەنسی هەمان کاردانەوەی چەند ڕۆژێک بەر لەو ڕووداوەی نەبوو کاتێ مامۆستا فەڕەنسییەکە کوژرا؟!

بۆچی نوێنەرانی ڕاستڕەوە کۆمارییەکان لە کۆبوونەوەی پەرلەمانیدا هاتنەدەرەوە، وەک ناڕەزایی دەربڕین بۆ ئامادەبوونی قوتابییەکی لەچکبەسەر لە نێوانیاندا؟! ئایا مافی خۆی نییە وەک چۆن حەز دەکات، ئاوەها ناسنامەی خۆی دەربڕێت؟!

ئایا جیاوازی هەیە لە نێوان ئازادیی ڕادەربڕین و گاڵتە و سوکایەتیکردن بە ئەوانی دیکە؟!

هەر بەڕاست فەڕەنسا ئازادیی ڕادەربڕینی بۆ هەموان و لە هەموو کەیسەکاندا دابین کردووە؟ یان فەڕەنسا تەنیا ئامرازی ڕووناککەرەوەیە بۆ ئەو کەسانەی هاتوونەتە نێو ئایینی بەها فەڕەنسییەکانەوە؟ یان بە دوو ڕبە دەپێوێت و تاریکییەکانی لە ژێر پەردەی ئازادبوون و ڕۆشنگەری داپۆشیوە؟!

ئەم پرسیارانە و چەندینی دیکە، نیشانەی سەرسووڕمان دەخەنە سەر ئازادی ڕادەربڕین و دووفاقی بەها فەڕەنسی و ئەوروپییەکان.

هَجَـوْتَ مُحَمَّـدًا بَـرًّا حَنيفًـا      رَسُـولَ اللـه شـيمَتُهُ الْوَفَـاءُ

فَــإِنَّ أَبي وَوَالــدَهُ وَعــرْضي لعــرْض مُحَمَّــد مــنْكُمْ وقَــاءُ

قسـەت بە مـوحەممەدی پـاکی ڕاسـت وت پێغەمـبەری خوایـــە سیفاتـــی وەفایـــە

بـــاوکم و بـــاوکی و نـــامووســـم بـۆ ناموسی مـوحەممەد لەدەست ئێوە پارێزە

# دەمامکە ساختەکە.. چۆن عەلمانییەت تاوانەکانی ڕاسترەوە توندڕەوەکان بەرامبەر موسوڵمانان دەشارێتەوە

(زیـــادبوونی ژمـــارەی شـــوێنکەوتوانی ئەم ئـــایینە و ڕەفتـــارە پەیوەندیدارەکانیان کێشەمان توش دەکات).

(کلۆد گییان/ وەزیری ناوخۆی فەڕەنسا)

لە دەی ســــــێپتێمبەری ســـــاڵی (٢٠١٠ی زایینـــــی)دا ژنە پەرلەمانتـاری پەرلەمـانی ئەوروپـا (مـاری لـۆبین) سـەرۆکایەتیی کۆبوونەوەیەکی گشتیی حیزبی بەرەی نیشتیمانیی لە شاری لیۆن کـرد. لەپێنـاو هانـدانی ئەنـدامانی حیـزبەکەی بـۆ دەنگپێدانی وەک سـەرۆکی حیـزب، لۆبـۆن دەسـتی کـردە باسـکردنی لاوانـدنەوە هەمیشـەییەکەی فەڕەنسـا: دووەم جەنگـی جیهـانی و داگیرکـاریی ئەڵمانیـا بـۆ وڵاتەکەی، گەیشـتە بەراورد و پێکبەسـتنێکی سـەیر لە نێـوان ئەو نـوێژانەی کۆمەڵێـک موسـوڵمان لە جادەکـانی پاریسـدا ئەنجـامی دەدەن و ئەو داگیرکـارییە سـەربازییەی وڵاتەکە لە کـاتی جەنگدا دووچاری بووبووەوە!

بەهـانەی قسـەکانی ئەوە بـوو نـوێژی موسـوڵمانان لە دەرەوەی مزگەوتەکانیـان جـۆرێکە لە (پاوانکـاریی شـوێنە گشـتییەکان، داگیرکـاریی چەنـد پـارچەیەک لە سـامانی گشـتی و چەنـد گەڕەکێک یاسای ئایینییان تێدا جێبەجێ دەکرێت).(٤٣)

لۆبین پێویستی بە گوتارێک بـوو، کە هاوسەنگی لە نێوان دوو شـتی دژیەک بپارێزێـت: ئەو میـانڕەوییەی سـەرکردایەتی پێویستییەتی و حەز و ویستی بـۆ ڕاکێشـانی ئەندامانی ئەم حیـزبە ڕاستڕەوە بۆ هەڵبژاردنی، بۆیە کۆمەڵناس و مێژوونووسی فەڕەنسی (جـۆن بـوبیرۆ) وای دەبینێت لـۆبین سەرکەوتوو بـوو لە هەڵبژاردنـی ئەو دەمامکەی ئەم هاوسەنگییە قورسەی بۆ دابین دەکات؛ ئەویش عەلمانییەت بوو!

وەک بـوبیرۆ دەڵێـت عەلمـانییەت ئەو وشـە سـحرییەیە، کە ڕووکەشە شەرمهێنەکانی ڕاوبۆچوونەکانیان دادەپۆشێت، هەر لە ژێر ئەم دەمـامکەدا سـەرکەوتنی خێـرای ڕاسـتڕەوە تونـدڕەوەکان لە ئەوروپا و ئەمریکـا دەبینـین، پەیوەنـدیی ئەو گوتـارە توندڕەوەی دژی ئیسـلام و کـۆچکردنی نەوەکـانییەتی بـۆ جیهـانی مەسـیحیی ڕۆژئـاوایی، لەگەڵ لێکەوتەکـانی لە هەڵسـوکەوتی ڕەگەزپەرستانە بەرامبەر زۆرێک لە موسوڵمانان لە ڕۆژئاوادا.

ئەم تەوژمە چۆن فراوان بوو؟

چۆن ئیسلامی کردە ئەو خێوەی، کە دەنگی پێ کۆکردەوە؟

---

(٤٣) جون بيبيرو: العلمانية المزيفة.

## چیرۆکی سەرکەوتن، بەسادەیی

دەتوانین بەرەی ڕاسترەوی سیاسی بەوە پێناسە بکەین ئەو بەرە حزبییەیە لە هەوڵی پاراستنی بەها و دابەکانی کۆمەڵگەدایە، بەڵام ئەگەر وشەی (توندڕەو)مان خستە پاڵ وشەی (ڕاسترەو)، بۆمان دەردەکەوێت ئەم بەرە حزبییە قەت کێشەی لەگەڵ بەکارهێنانی هێز و دەستخستنە ناوی ملکەچکەر نییە بۆ پاراستن و سەپاندنیان، ئەوە سەرباری ئەو ڕەگەزپەرستییە توندەی ئەم ڕاسترەوانە بەرامبەر ڕەگەز و ئایینە بیانییەکان هەیانە. ئەمەیش مانای وایە ئیسلام و موسوڵمانان یەکەم دوژمنی ئەم ڕاسترەوانەن، گەورەترین مەیدانی پەیڕەوکردنی چەوساندنەوە و ڕەگەزپەرستیی شاراوەیانە لە ژێر دەمامکی عەلمانییەتدا.[٤٤]

زۆرێک لە شیکردنەوەکان وای بۆ دەچن ئەم هۆکاری سەرکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سستییەی دوای کۆتا قەیرانی ئابووریی جیهان هاتە پێشەوە، کە دوو دەرئەنجامی سەرەکیی هەبوو: یەکەمیان لەدەستدانی متمانە بوو بە بەرە ڕاسترەو و چەپڕەوە تەقلیدییەکان، دووەمیان ویستی جەماوەر بوو بۆ سزادانی ئەم دوو بەرەیە، کە بووە هۆی شەپۆلی نارەزایی و دەنگدان لە سوودی بەرەی ڕاسترەوی توندڕەودا، ئەمانیش لە لایەن خۆیانەوە بەڵێنی

(44) Camus, Jean-Yves; Lebougr, Nicolas (20-3-2017). Far-Right Politics in Europe .

ڕیشەکێشکردنی ئەم کێشانەیان دا.[٤٥] تێڕوانینی ئەم ڕاسترەوانە و جەماوەرەکانیان خۆی لە دژایەتیکردنی شەپۆلی کۆچ و پەنابەران بۆ وڵاتەکانیان دەبینێتەوە، بەتایبەت کۆچ لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبییەوە، چونکە پێشبڕکێی هاووڵاتیان دەکات لە هەلی کار و ناوەندەکانی دەسەڵاتدا، ئەمانە کۆهۆکاری سەرەکیی زیندووکردنەوەی بەهێزی ڕەگەزپەرستی و رقلێبوونەوە بوون لە بەرامبەر ئەم تازە هاتوانە[٤٦] و ئەمیەش لە لای خۆیەوە بووە هۆی ڕەخساندنی ژینگەیەکی لەبار بۆ هێزە سیاسییە توندڕەوەکان و سەرکردەگەلێکی توندڕەوی هێنایەکایەوە بە جەماوەرێکی زۆرەوە.

ڕەنگە ئەنجامی هەڵبژاردنی فەرەنسا ڕاستگۆترین بەڵگە بێت بۆ ئەم سەرکەوتنە، کە تێیدا (مارلی لۆبین) باشترین ئەنجامی بەدەستهێنا، کە تا ئێستا ڕاسترەوە توندڕەوەکان بەدەستیان هێنابێت، تێیدا گەیشتە خولی دووەمی هەڵبژاردنەکان، پاشان بەدەستهێنانی لە سەدا سی و سێی کۆی دەنگەکان؛ واتە نزیکەی دە ملیۆن دەنگدەر لە وتارە ڕەگەزپەرستانەکەیدا دژی موسوڵمانان ئومێدیان دەبینی، بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم جۆرە دەنگدەرانە توانییان بگەنە ئامانجەکەیان کاتێ (دۆناڵد ترامپ) کورسیی سەرۆکایەتی بردەوە.[٤٧] وێڕای ڕەگەزپەرستییە گشتییەکەی ڕاسترەوەکان بەرامبەر ڕەگەز ئایینە جیاوازەکان، بەڵام ئەم

---

(٤٥) رابح زغوني: صعود اليمين المتطرف في أوروبا.. تعبير عن عداء سياسي أم مجتمعي للإسلام؟

(٤٦) Kristian Voss, Op. Cit, p.8.

(٤٧) رابح زغوني: صعود اليمين المتطرف في أوروبا.. تعبير عن عداء سياسي أم مجتمعي للإسلام؟

ڕەگەزپەرستییە زیاتر لەسەر ڕوانینێکی ئابووری بیناکرابوو، کە لەم غەریبانەدا پێشبڕکێکارێک بۆ هەلە ئابوورییەکان دەبینن.

لە سەروو ئەمەوە، دەروازەیەکی دیکەی ئابووری و شارستانی هەیە، کە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان بە شێوەیەکی تایبەت دژی موسوڵمانان بەکاری دەهێنن:

(یانزەی سێپتێمبەر).. فەزاحەتە دروستکراوەکە!

ئەگەر بگونجێت بپرسین ئایا ئەو ڕووداوە مێژووییە چی بوو، کە بووە سەرەتایەک بۆ پەرەسەندنی ڕەگەزپەرستی ڕۆژئاوایی دژی بەرامبەرەکانی بەگشتی و عەرەب و موسوڵمانان بەتایبەتی؟ ئەوە ڕووداوەکانی یانزەی سێپتێمبەری ساڵی (٢٠٠١ی زایینی) باشترین وەڵامە بۆ ئەم پرسیارە. لەو چرکەساتەوە، تاکو ساتی ئەمڕۆ، بەناوی جەنگ دژی تیرۆرەوە گەلێک کردەوەی ڕەگەزپەرستی بەهێمنی بەرامبەر موسوڵمانان تێدەپەڕێنرێن، کە زۆرێک وەک جەنگێک دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان دەیانبینن.[٤٨]

کۆچبەرە موسوڵمانەکان لەم وڵاتانەدا، یەکەمین ئامانجی ئەم هەڵسوکەوتانە بوون، ئەم کۆچبەرە داماوانە لە وڵاتانی خۆیان بەرەو ئەمریکا و ئەوروپا هەڵهاتن لەپێناو گەڕان بە دوای ئەو ئارامییەی لە وڵاتەکانیاندا ونە، بەڵام بەر نێوقەدی کەتوارێکی جیا کەوتن، کە وەک سەرچاوەی هەڕەشەیەکی دەرەکی بۆ یەکڕیزی و ئارامی دەوڵەتەکە سەیر دەکرێن.

---

(٤٨) بلخير آسيا: قضية الحجاب في فرنسا بين حماية العلمانية وتقنين الاسلاموفوبيا.

ئەمە بووە هۆی پێکدادانێکی شارستانی و رۆشنبیریی توند لە کۆی ئەو شوێنانەی ئیسلام ئامادەیی زۆر بووبوو لەو بەشانەی رۆژئاوا، کە ئەوانی دیکە قەبووڵ دەکات و لەگەڵیان دەتوێتەوە و بەپێی کۆمەڵە رووداوێکی بەناوبانگ کە لەم سەدەیەدا ناوبانگیان پەیدا کرد، دەبینین ئەم پێکدادانە دەستیانکردووە بە سەرهەڵدان لە شێوەی توندوتیژی و هەڵسوکەوتی رەگەزپەرستانە بەرامبەر موسوڵمانان؛ وەک سووکایەتیکردن بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لە رێی کاریکاتێرەوە، قەدەغەکردن و بە تاوانکردنی حیجاب لە فەرەنسا، پرسی قەدەغەکردنی جەوتەرە (مئذنة)ی مزگەوت لە سویسرا، داوای سنووردانان بۆ کۆچ لە ئەڵمانیا و شوێنی دیکە.[٤٩]

ئەمە هەمووی، لە پاڵ لێدوانە دوژمنایەتیئامێزەکاندا، کە زوو زوو سەرهەڵدەدەن، بەبێ گوێدانە هیچ پلەیەکی دیبلۆماسیی سیاسی، لەوانەیە دیارترینی ئەو دروشمانە ئەوە بێت، کە لە لایەن حیزبی نەمساویی راسترەوی شەعبەوییەوە بەرزدەکرێتەوە، کە ئیسلام وەک دوژمنی گەلی نەمسا و ئەوروپا و تەواوی جیهان دەبینێت؛ هەروەها هاوتا دانیمارکییەکەی، کاتێ لە سەروەختی هەڵمەتی هەڵبژاردندا هۆشداری دەداتە جەماوەر لە مەترسیی ئیسلام بەرامبەر شارستانییەتی رۆژئاوا بە شێوەیەکی گشتی. کەچی پارتی بەرەی

(٤٩) كربوسة عمراني: الاسلاموفوبيا في أوروبا: بين إرث الماضي وتحدي الراهن.

نیشـتیمانی فەرەنسـا لەسـەری سـەرەوەی لیسـتەکە دێـت کـاتێ ئیسلامۆفۆبیای کردووە بە داردەستی هەڵمەتی هەڵبژاردن لە ساڵی (۲۰۱۷ی زایینی)دا لەسەر دەستی (ماری لۆبێن).[٥٠]

لە پاڵ لێدوانە دامەزراوەییەکاندا، هێرشی تاکەکەسی لە لایەن سەرکردە دیارەکانی ڕاستڕەوەکانەوە قەت نەوەستاوە[٥١]، (ئۆنبرتۆس بوسی) سەرۆکی حیزبی (لیگانۆرد)ی ئیتاڵی، ئیسلامی وەک گەورەترین هەڕەشە بۆ سەر کلتووری ئەورووپا وەسف کرد،؛ هەمان شت لای (خەیرەت فلدەریس) سەرۆکی حیزبی گەلی هۆڵەندی دووبـارە بـووەوە، کـاتێ ئیسـلامی بەراورد کـرد بە فاشـیزم و موسـوڵمانانی بە دواکەوتـوو نـاوبرد و وتـی پێویسـتە ڕێگرییـان لـێ بکرێت لە کۆچکردن بۆ ولاتەکەی.

بە هەمـان شێوە (سیلۆ سارازین) نوێنەری حیزبی دیموکراتی کـۆمەلایەتیی ئەڵمـانی، کە ئـاوارە موسـوڵمانەکانی بە هۆکـاری هەژارکردنـی ولاتەکەی دانـا و لەوەی دانیشـتوانەکەیان گەمژەتـر کردووە، چونکە - بە جینات - لە ئەڵمانەکان زیرەکییان کەمترە.[٥٢]

بەهـۆی ئەم جـۆرە لێـدوانانە و چەنـدانی تـرەوە، زۆر پێویسـت بە خەیـاڵکردن ناکـات، تـاکو وێنـای ئەوە بکەیـت موسـوڵمانان تووشـی چی دەبن لە کەتوارێکی ڕەگەزپەرستانەی وەک ئەمەدا.

---

(٥٠) سەرچاوەی پێشوو.

(51) Threat of the far right in Euroupe.

(52) Are Muslim immigration making Eruope poorer and stupider ?

## درۆی ئیسلامۆفۆبیا!

شیکردنەوەی چەمکەکان بە گرنگترین هەنگاوی شیکردنەوەی هەر ڕاستییەک دادەنرێت، چونکە هەموو چەمکێک دوو پێناسەی گرنگی لە ناخیدا هەڵگرتووە: بیردۆزە بیناکەرەکانی و ئەوەی لە واقیعدا جێبەجێ دەکرێت. بە ڕوانین لە چەمکی (ئیسلامۆفۆبیا)، کە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان بۆ دژایەتیی ئیسلام بەکاری دەهێنن، دەبینین بیردۆزە بیناکەرەکانی (کۆمەڵێک ترس و بڕیاری پێشوەختەیە بەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان).[٥٣]

بەڵام واقیع ئەوەمان پێ دەڵێت، کە ئەم ترسە خەیاڵاوییانە لە زۆر کاتدا دەگەنە هەڵسوکەوتی دوژمنکارانە و توندئاژۆیانە بەرامبەر موسوڵمانان، ئیدی ڕاستەوخۆ کرداری بێت وەک حاڵەتەکانی چەوساندنەوە و دەستدرێژی لاشەیی، یان ڕەمزی بێت وەک یاسا فەرقەکەرەکان و لێدوانە ڕەگەزپەرستانەکان دژی موسوڵمانان؛ ئەمەیە، کە ئەکادیمی جەزائیری (طيبي غيماري) سەرنجی دەخاتە سەر و دەڵێت: "ئیسلامۆفۆبیا چەمکێکی درۆیینەیە بۆ دیاردەیەکی ڕاستەقینە، بە شێوەیەکی دروست گوزارشت لە ڕاستییەك ناکات، بەڵکو جوانی دەکات و لە شوورەیی دەیپارێزێت".

بیرمەندی تورکییش (عومەر ئۆرهۆن) هەمان ڕای هەیە،

(٥٣) غماري طيبي: الإسلاموفوبيا.. مصطلح زائف لظاهرة حقيقية.

کاتێ دەڵێت: ئیسلامۆفۆبیا گوزارشتە لە: (نالێبوردەیی و جیاکاری ڕەگەزپەرستی بەرامبەر ئیسلام و موسوڵمانان).[٥٤]

هەروەها وشەی (فۆبیا) ئاماژەیە بۆ ئەوەی نەخۆشینێک بووەتە هۆی ئەم ترسە بەرامبەر ئیسلام، ئەمە داردەستی دەستی توندڕەوەکانە لە ڕێیەوە بەهانە بۆ توندڕەوییەکەیان و ئەو شورەییەی لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتووە دەهێننەوە و تاوانبار دەکەن بە قوربانی و قوربانییش بە تاوانبار.

بەڵام چەمکێکی دیکەی وەک (دژایەتیی سامییەت) دەبینین ڕاستەوخۆ تاوانبار دیاری دەکات و وەک دوژمن دەیناسێنێت، بەڵام ئەگەر چەمکەکە (سامۆفۆبیا) بوایە ئەوە ماناکەی چەواشە دەبوو، هەر ئەمەیە وای لە طەیبی کرد بلێت بەکارهێنانی چەمکی ئیسلامۆفۆبیا بۆ چەوساندنەوەی موسوڵمانانە لە هەڵسوکەوتی ڕەگەزپەرستانە و گوتاری توندڕەوی هۆکاری چەواشەکاریی ڕاستییەکانە و تاوانبار دەپارێزێت و بەهانە بۆ کارەکەی دەهێنێتەوە.

هەرئەمە هۆکاری ڕوونکەرەوەی زیادبوونی شەپۆلەکانی هەڵکشانی دەستدرێژیکردنە سەر موسوڵمانانە، بەناوبانگترینیان ڕووداوی (کرایست تشیرش) بوو لە نیوزیلەندا، کە تێیدا تیرۆریستێکی ڕاسترەوی توندڕەو لە کاتی نوێژی جومعەدا لە مزگەوت پەنجا کەسی نوێژخوێنی کوشت.[٥٥]

---

(٥٤) Omur Orhun, Intolerance and discrimination against Muslims.

(٥٥) نيويورك تايمز في رسالة الى ترمب: مروجو العداء للمسلمين أيديهم ملطخة بالدماء
https://shorturl.at/dMYZ1

هەرچەنــدە ڕووداوەکە لە نیوزیلەنــدا ڕوویــدا، بەڵام (نیویــۆرک تایمز) ڕووداوەکەی دایە پاڵ ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی هەمـوو جیهان، کردییە بەڵگەی گەشەکردنی ئایدۆلۆژیای ڕاستڕەوە توندڕەوەکان لە ڕۆژئـاوادا؛ هەروەهـا هەرکەسێک بانگەشـە، یـان یارمەتیـدەری بڵاوکردنەوەی ئەفسانەی (موسوڵمانان مەترسین بۆ سەر جیهـان)ی کردبێـت، دەسـتی سوورە بە خـوێنی کوژراوەکـان، بەپێی دەربڕینـی ئەوان. هەروەهـا گۆڤـاری (فـۆرن پۆلیسـی) وای دانـا هەڵکشـانی ڕاســـتڕەوی توونـــدڕەو دژایەتیکردنـــی ئیســـلامی کـــردووەتە جـووڵانەوەیەکی جیهـانی، ئامـاژە بـۆ ئەوە دەکـات لە سـێبەری ئەم ڕاستییەدا دەکرێت هێرشەکانی نیوزیلەندا لە شوێنی دیکەیش دووبارە ببێتەوە.

هەروەتر بەپێی ڕاپۆرتێک، کە (بی بی سی عەرەبی) ئامادەی کــردووە، خــودی پەیــامی ڕاســتڕەوەکان لە زۆرێــک لە وڵاتــانی ڕۆژئاوا بەهانە بۆ دوژمنکاری بەرامبەر موسوڵمانان و کۆچبەرەکـان دەهێنێــتەوە، کە تاوانباریــان دەکــات بە هەوڵــدان بــۆ گــۆڕینی شارساتانییەتی ئەو وڵاتە ڕۆژئاواییانەی کۆچی بۆ دەکەن.(٥٦)

بەڵام لە پشــت هەمــوو ئەم تاوانــانەوە، لە پشــت ئەم پەیــامە توندڕەوەوە، عەلمـانییەت بە دەمـامکە درۆیینـەکەیەوە ڕاوەسـتاوە بـۆ پاراستنی ئەم ڕەگەزپەرستییە دەمامکدارە. لەوانەیە باشترین نموونە بــۆ ئەم حــاڵە بیانووهێنــانەوەی فەڕەنســا بێــت بــۆ یاســای

(٥٦) هل ساهم صعود أحزاب اليمين الشعبوي في الغرب في تغذية (الاسلاموفوبيا)؟
https://shorturl.at/nOQST

(بەرهەڵستکردنی جیاخوازی)، کە پەرلەمان لە یۆلیۆی (۲۰۲۱ی زایینی)دا پەسەندی کرد، لە دوای ژمارەیەک ماددەی زۆر لە بەتاوانناساندنی لەچککردنی هەرزەکارەکان لە قوتابخانەکانیاندا، هەڕەشەی غەرامە و بەندکردن لەو دایکانە دەکات، کە بەلەچکەوە لەگەڵ منداڵەکانیان دەچن بۆ گەشتەکانی قوتابخانە.

یاسادانەرەکانی ئەم یاسا ڕەگەزپەرستییە ناوێکی جوانتریان نەدۆزییەوە خۆیانی پێ جوان بکەن (بەرهەڵستیکردنی جیاخوازی لە عەلمانییەتی دەڵەوت) نەبێت، کە بەهۆیەوە دەمامکە درۆیینەکەیان بخەنە سەر دەموچاوە ناشرینەکەیان، لە بیریان کردووە، یان لە بیری خۆیانیان بردووەتەوە، کە عەلمانییەتە لافلێدراوەکەیان دەستەبەری ئازادیی هەموو مرۆڤێکە بۆ هەرشتێک بیەوێت.

بەڵام ئەم ئازادییە خرایە خزمەتی دژایەتیی خودا و شەریعەتەکەی، نەک بۆ پەسەندکردنی، هەر بۆیە فەیلەسووفی فەڕەنسی (جۆن بۆبیر)، ناوی نا (عەلمانییەتی درۆیینە).

# لە نێوان دوو ناسنامەدا..
# نەوەی موسوڵمان لە ڕۆژئاوادا ڕووبەڕووی چی دەبنەوە؟

لە نۆزدەی نۆڤەمبەری (٢٠١٧ی زیینی)دا، (پەیمانگای پیو)ی ئەمریکی بۆ لێکۆڵینەوە، لیکۆڵینەوەیەکی دەگمەنی لەسەر گەشەی ئیسلام لە ئەوروپای بڵاوکردەوە، تێیدا هاتبوو ڕێژەی موسوڵمانان لە ئەوروپا، تا ساڵی (٢٠١٦ی زایینی) گەیشتووەتە نزیکەی لە سەدا پێنجی ڕێژەی گشتیی دانیشتوان.[٥٧]

ئەو ڕێژەیە بەهۆی داوای پەنابەرێتیی سیاسی لە دوای شۆڕشە عەرەبییەکانەوە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد؛ لە نێوان ساڵانی (٢٠١٠)، تاکو (٢٠١٦) ڕێژەی موسوڵمانان لە ئەوروپا لە نۆزدە ملیۆن و پانزە هەزار کەسەوە، زیادی کرد بۆ بیست و پێنج ملیۆن و هەشت سەد هەزار کەس.

بەهۆی بەرزیی ڕێژەی پیتاندن و زۆریی پەنابەرە گەنجەکان و سەقافەتی منداڵبوونی جیاواز لە هاووێنە ئەوروپییەکەی، لێکۆڵینەوەکان پێشبینی دەکەن، تا ساڵی (٢٠٥٠) موسوڵمانان ڕێژەی لە سەدا یانزە پۆینت دووی دانیشتوانی ئەوروپا پێکدەهێنن، ئەمە ئەگەر بەربەستی ناچاری وەک جەنگ و نەخۆشی و

(٥٧) Europe's Growing Muslim Population. https://shorturl.at/aPT37)

هاوشێوەکانیان ڕوونەدات، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا لەوانەیە ئاستەنگ و بەربەستی زۆر بێنە ڕێی ئەو گەشەکردنەی، کە لێکۆڵینەوەکە پێشبینیی کردووە. لەگەڵ ئەمەدا کۆمەڵێک پرسیار دێنە پێشەوە لە بەرامبەر چارەنووسی ئیسلام و موسوڵمانان لە ئەوروپا و ئەمریکادا، ئایا تا چەند ژینگەی ئەوروپی پێویستی بە وریایی هەیە بۆ پاراستنی داهاتووی ئیسلام تێیدا، بەتایبەت لە بارەی نەوەی دووەم و سێیەمی کۆچبەران، کە لەدایک بوون و گەورەبوونی لە ڕۆژئاوادا بووە؟

ئەو ئاڵنگارییانە چین ڕووبەڕووی ناسنامەی ئیسلامی دەبنەوە و هەڕەشەن بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلامی لەم وڵاتانەدا؟

ئەو ترسانەمان چین، کە پێویستیان بە هۆشیاری هەیە لەپێناو داهاتوویەکی سەلامەتتر و گەشاوەتر بۆ موسوڵمانەکانمان لە ڕۆژئاوا؟

## تەڵەی پەنابەری

لە دوانزەی مایۆی (٢٠١٧ی زایینی)دا، دامەزراوەی (دۆیتشە)ی ئەڵمانی نووسراوێکی ڕۆژنامەوانییان بڵاوکردەوە دەربارەی پەنابەرە فارسەکانی ئێران و ئەفغانستان، تێیدا شایەتیی قەشە (گۆتفرید مارتینێز) هاتبوو، کە تەنیا لە ماوەی یەک دەیەدا لەناوهەڵکێشان (بەمەسیحیکردن)ی بۆ نزیکەی هەزار و دوو سەد پەنابەری ئێرانی کردووە.(٥٨)

(٥٨)لماذا يتحول الاجنون الايرانيون من الاسلام الى المسيحية؟

زیاتر لەسەری دەڕوات و دەڵێت: "ژمارەی سەردانکەرە فارسەکانی کڵێسای بەرلین بەتەنیا لە ساڵی (٢٠١٦ی زایینی)دا گەیشتووەتە سیانزە هەزار پەنابەر. مارتینێز هۆکاری ئەم ئایینگۆڕینەی پەنابەران دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە پێیانوایە بەم هۆیەوە چانسی وەرگرتنی مافی پەنابەرێتییان زیاد دەکات". هەروەها ڕۆژنامەی (سەندەی تایمز)یش هەمان ڕای هەیە، دەڵێت: "ژمارەیەک لە پەنابەرە موسوڵمانەکان لە ئەڵمانیا بڕیاری بوون بە مەسیحییان داوە، لەپێناو زیادکردی چانسی وەرگرتنی مافی پەنابەریی سیاسی و نەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان، کە باری سیاسی تیادا نالەبارە".[(٥٩)]

درێژەی دەداتێ و دەڵێت: "یەک کڵێسا وەک کڵێسای (سیگلیتز) سەردانکەرانی لە چوار هێندە، تاکو حەوت سەد هێندە زیادی کردووە لە دوای قەیرانی پەنابەران لە هاوینی (٢٠١٥ی زایینی)دا". کارەکە ئەمەی زیاتر تێپەڕاندووە، بەپێی ڕاپۆرتێک، کە ڕۆژنامەی (تێلیگراف)ی بەریتانی لە بەیرووت ئامادەی کردووە، دەڵێت: "بە لایەنی کەمەوە سەدان پەنابەری ناوخۆی سووری لە وڵاتەکەدا ئایینیان گۆڕیوە لەپێناو سوودوەرگرتن لەو یارمەتییانەی ڕێکخراوە مەسیحییەکان دابەشی دەکەن، هەروەها بۆ باشترکردنی چانسی وەرگرتنی داوا تایبەتەکانی پەنەرێتییەکانیان لە ئەوروپادا".[(٦٠)]

---

(٥٩) صنداي تايمز: لاجئون مسلمون في ألمانيا يتحشدون للتحول للمسيحية. https://shorturl.at/demlxZ24

(٦٠) الارتداد عن الإسلام في أوروبا. https://shorturl.at/demNV

ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ لێکۆڵینەوەکەی تایمزی بەریتانی، ڕۆژنامەوان (لۆگان بانفیشسکی) دەڵێت: "زۆریی ڕێژەی بەمەسیحیبوون لەپێناو پەنابەریدا وای لە حکومەتی ئەڵمانیا کردووە نییەتی پەنابەران تاقی بکاتەوە، هەمان شت وای لە کڵێسەی نەمساوی کردووە نییەتی داواکارانی بەمەسیحیبوون لەپێناو پەنابەریدا تاقی بکاتەوە، کردوویەتییە مەرج لەسەریان ماوەی یەک ساڵ بخرێنە ژێر بەرنامەیەکی ئامادەسازییەوە، لە نێوان ئامادەسازییەکاندا بەشداریکردن لە وانە و سرووتی ئایینی و جیبەجێکردنی فەرمایشتە ئایینییەکان و خزمەتکردنی کۆمەڵگە هاتووە".

بە ڕوانین لە هەموو ئەمانە[٦١]، دەبینیت دۆسییەی مسوڵمانان لە ڕۆژئاوا ڕووبەڕووی کێشەیەکی گەورە بووەتەوە و پێویستی بە دەستتێوەردانێکی خێرا هەیە، پێویست بە یەکخستنی هێزە بانگخوازییە سەرپەرشتیارەکانی دۆسییەی ئیسلامی دەکات لە ڕۆژئاوادا. ئەم پەنابەرانە لەپێناو دونیایان لە وڵاتەکانی خۆیان لە ترسی جەنگ هەڵهاتن، پێویستیان بە یەکێکە دوارۆژیان ڕزگار بکات لە تەڵەی بەمەسیحیکردن لە پەناگەی ئەورووپیدا، ئایا چارەسەرێک هەیە بۆ ئەو کەسەی جەنگ دونیاکەی شەکەت کردووە و لە ئایینەکەیدا تووشی فیتنە بووە؟

(٦١) لماذا يتحول المهاجرون المسلمون الى المسيحية في النمسا؟
https://shorturl.at/elmwX

بەڵام، ئەگەر دایـــک و بـــاوکەکەیش پارێزگارییـــان لە ئیسلامەکەیان کرد و داوای مافی پەنابەری هەڵینەخەڵەتاندن، ئایا ئەمە گەرەنتیی پارێزراویی منداڵەکانیان دەکات؟

یان پەناگەی ئەوروپی ڕایەکی دیکەی هەیە؟

## دایابێکی بێ منداڵ

لە پانزەی دیسێمبەری (٢٠٢١ی زایینی)دا، دادگای ئەوروپی بۆ مافەکانی مرۆڤ، لە بەرژەوەندیی (ماریا عەبدی ئیبراهیم)ی سۆماڵی، بڕیاری دا بە دایەنیکردنی منداڵەکەی و وەرگرتنەوەی لە خێزانە نەرویجییە بەخێوکەرەکەی.[٦٢]

بەڵێ، ئەوەی بیستت ڕاستە!

بەدرێژایـــی شـــەش ســـاڵ، ئەم ژنە زگســـووتاوە لە ڕاڕەوی دادگاکاندا بە دوای کوڕەکەیەوە بوو، بەر لەم شەش ساڵەیش پێنج ساڵ ڕەنجی دووریی منداڵەکەی دەبینی، چونکە دەسەڵاتی نەرویجی منداڵە شیرەخۆرەکەی لێ سەندبووەوە پێش ئەوەی ساڵی یەکەمی تەمەنی تەواو بکات، بە بیانووی ئەوەی لە مەترسیدایە!

ئەم دایکە دەبینێت منداڵە موسوڵمانەکەی بەتۆپزی خراوەتە بەر دایەنی خێزانێکی مەسیحییەوە، کە بەئاسانی دەتوانن ناو و ئایین و

(٦٢) النرويج.. لاجئة مسلمة تربح قضية استرداد طفلها من اسرة مسيحية.
https://shorturl.at/aoPU0

کۆی ژیانی بگۆڕێت، پێش ئەوەی بە بڕیاری دادگا دڵت خۆش بێت. (ماریا) دەڵێت هەرچەندە بڕیاری دووەم لە بەرژەوەندیی ئەم دراوە بە گەڕاندنەوەی منداڵەکەی، بەڵام هێشتا منداڵەکەی لە باوەشی خێزانە نەرویجییە مەسیحییەکەدایە. بەدەر لە مشتومڕی ئەوەی بڕیارەکانی دادگا ناچارکەرن یان نا، بێگومان حاڵەتەکەی (ماریا) یەکەم و کۆتا حاڵەت نابێت، هەروەها بابەتەکە تەنیا لە نەرویجدا کورت نابێتەوە، زۆرێک لە وڵاتە ئەوروپییەکان دامەزراوەگەلێکی کۆمەڵایەتییان تێدایە مافی ئەوەیان پێدراوە منداڵ لە خێزانەکەی بسێنن هەرکات بڕیار بدات ئەو ژینگە بۆ منداڵەکە ئاساییش نییە. لە سەری سەرەوەی ئەم دامەزراوانەدا دامەزراوەی (یوگندامت)ی ئەڵمانی بۆ خۆشگوزەرانیی منداڵ دێت، کە زوو زوو مشتومڕ لە دەوری خۆی دروست دەکات، لەگەڵ ڕێکخراوی (کافکاس)ی بەریتانی بۆ یارمەتیدانی مافی منداڵ، ناوەندی (سۆسیال)ی سویدی تایبەتمەند بە پێشکەشکردنی هاوکاریی کۆمەڵایەتی لە ناوخۆی سویددا.[٦٣]

بەپێی ڕاپۆرتێکی تۆڕی (TRT)، بۆ نموونە دامەزراوەی یوگندامت ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بووەتەوە، چونکە خێزان و منداڵە کۆچکردووەکان دەکاتە ئامانج و حاڵەتی ناڕاست دروست دەکات بە مەبەستی لێسەندنی منداڵ لە دایک و باوکی، ئەویش لەپێناو وەرگرتنی پارە و یارمەتی لە دەوڵەتەوە.

چالاکوانی مافناس (جەلال محەمەد ئەمین) لە لێدوانێکیدا بۆ

(٦٣) ظاهرة سحب حضانة الأطفال.. كابوس العائلات العربية والمسلمة في الغرب.
https://shorturl.at/fRVX6

وێبسایتی (موهاجیر نیوز) دەڵێت: "دەسەڵات لە ئەڵمانیا بە دوای بیانوودا دەگەڕێت بۆ زەوتکردنی مافی بەخێوکردنی منداڵ لە دایک و باوک، وەک پەلپی کەمتەرخەمی دایک و باوک لە دابینکردنی مافی خۆشگوزەرانی بۆ منداڵ، یان نیشاندانی نیشانەی زیاد لە پێویستی پارێزگاریلێکردن، یان ناسەقامگیریی باری سۆزداری نێوان دوو هاوسەرەکە و چەندین بەهانەی لاستیکیی دیکە، کە سنوورێکی ڕوونی بۆ دیار نییە".

جەلال دەشڵێت: "ئەوەی کارەکە گوماناویتر دەکات ئەوەیە بەڕێوبەرایەتیی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتی و دادگا ئەڵمانییەکان مافی شاردنەوەی پێوانەی هەڵسەنگاندنەکانیان بەکاردەهێنن".[٦٤]

بە سەفەرکردنمان بەرەو وڵاتێکی دیکەی وەک سوید، کێشەکەمان بچووکتر نابێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە خراپترە، چونکە ڕێکخراوی (سۆسیال)ی سویدی کارڕایی لێسەندنی منداڵ، تاکو هەژدە ساڵی ئەنجام دەدا، بەڵکو لە بڕیارەکانیدا پشت بە پەیام و شایەتی دراوسێ سویدییەکانیان دەبەستێت.

بەپێی دامەزراوەی سویدی بۆ زانیاری، (سۆسیال)ی سویدی هەموو ساڵێک بیست هەزار منداڵ لە خێزانەکان زەوت دەکات و دووبارە دابەشیان دەکاتەوە بەسەر خێزانی نوێدا[٦٥]، تەنانەت ئەگەر هۆکاری ئەمەیش خراپیی باری دارایی و تەندروستی دایک و

(64) Parents losing custudy of their children in Germany – reasons and procedures. https://shorturl.at/pyz79

(٦٥) السوسيال يسحب ٢٠ ألف طفل كل عام من عوائلهم.. والحل القانوني يساعدك عندما يأخذ السوسيال أطفالك.https://shorturl.at/lqtx3

باوکەکەش بێت. ڕێک وەک ئەوەی بەسەر سەلوای مەغریبیدا هات کاتێ سۆسیال بێبەشیان کرد لە کوڕە بچووکەکەی بەهۆی کێشەی دارایی و تەندروستییەوە، لەبری ئەوەی هاوکاریی منداڵ و دایکەکە بکەن، دامەزراوەکە جێی هێشت، تا بەهێواشی بمرێت؛ ئەمە دوای ئەوەی تاقانەکەیان لێسەند و و منداڵەکەیان دا بە خێزانێکی مەسیحی، بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان یاری بە ئایینەکەی بکە.[٦٦]

لە کەتوارێکی وەک ئەمە و لە ژێر سێبەری دەسەڵاتێکی پانوپۆڕدا، کە بووەتە مەترسی بۆ سەر ئایینی نەوەی داهاتووی کۆچبەران، ئاڵنگارییەکی مەترسیدارتر ڕووبەڕووی موسوڵمان و منداڵەکانیان دەبێتەوە لە ڕۆژئاوادا. ڕووبەڕووی مشتومڕێکی زۆر بووەوە لە لایەن موسوڵمانانی ئەورووپاوە، بۆیە ڕێپێوانیان لە دژی ئەنجام دا و لەپێناویدا چەندین دەسپێشخەری کران بۆ جەنگان دژی ئەم دەستدرێژییە زۆردارانەیە بۆ سەر منداڵی موسوڵمانان و داهاتووی ئایینییان، لە پاڵ هەموو ئەمەدا، بەرەنگارییەکی نوێ سەرهەڵدەدات ئاشتیانەتر و کەمتر سەندەکی (ئیبتیزا)یی، بۆیە لەوانەیە مەترسیدارترینیان بێت.

(٦٦) القصة الكاملة.. مهاجرة مغربية توفيت بعد أن إنتزع السوسيال حضانة طفلها منها في السويد.https://shorturl.at/hklmn

## لە نێوان دوو ناسنامەدا

لە بیست و شەشی یەنایەری (٢٠١٨ی زایینی)دا، (پەیمانگای پیو) بۆ لێکۆڵینەوە، ڕاپۆرتێکی دیکەی دەربارەی موسوڵمانانی ڕۆژئاوا بڵاوکردەوە، بەڵام ئەمجارە نموونەی لێکۆڵینەوەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو. لە ئەنجامدا لێکۆڵینەوەکە ڕایگەیاند لە سەدا بیست و سێی دانیشتوانی ئەمریکا بە بیروباوەڕەکانیانەوە ڕوویان کردووەتە ئیسلام، هەروەها بە هەمان ڕێژە وازیان لە بیروباوەڕە ئیسلامییەکانیان هێناوە و بە تەواوەتی دەستیان لە ئایین هەڵگرتووە![٦٧]

لێکۆڵینەوەکە ڕایگەیاند لەو کاتەی دانیشتوانی ڕۆژئاوا بەرەو ئیسلام دەڕۆن، ڕێژەی هەڵگەڕاوەکان لە ئایین، لە نەوەی موسوڵمانە لەدایک بووەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە، واتە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە منداڵی کۆچبەراندا کورتبووەتەوە لەوانەی ئایینەکەیان لە دایک و باوکیانەوە بۆ ماوەتەوە بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بیانبەستێتەوە پێیەوە؛ لە سەدا پەنجا و پێنجیان ئیلحادیان هەڵبژارد و کۆمەڵێکی دیکەیشیان ئایینگەلێکی دیکەیان هەڵبژارد، کە نایانبەستێتەوە بە سروتگەلێکی ڕێکخەر و پەرستش وەک ئیسلام. ئەوەی جێی سەرنجە ئەو هۆکارانە بوون، کە ئەو منداڵانە دەیانکردنە بیانووی هەڵگەڕانەوەکەیان، لە سەدا

(٦٧) Many former Muslims now say theyhave no religion._
https://shorturl.at/cJY13

دوانزەیـان دەڵـێن چیتـر حەزیـان بە پابەنـدبوون نییە بە ئـایینێکەوە، لە سـەدا پێنجیشـیان بـۆ ئەوەی دەگەڕێنـەوە ویسـتویانە لە پەیـڕەوە ئایینییەکـان دووربـکەونەوە، لە سـەدا نۆزدەیشـیان دەڵـێن ئیسـلامیان جێهێشتووە بەهۆی جیاوازییان لەگەڵ ڕێنمایی و سپاردە دینییەکان و نەبـوونی پەیوەنـدییەک، کە پێکەوەیـان ببەسـتێتەوە، ئەگەرچـی بە موسوڵمانێتییش لەدایک بوون.

بەپێـی لێکـۆڵینەوەیەکی دیـکە، ئەم هەڵـگەڕانەوە زۆرجـار لەساڵەکانی پێگەیشتنی گەنجێتیدا ڕوودەدات لە نێوان پانزە بۆ بیست و نۆ ساڵیدا.(٦٨)

لە لێکـۆڵینەوەیەکی کـۆمەڵایەتیی ڕۆژنـامەی (فـۆرین ئـافیرەز)دا، دەڵێت: "لە سـەدا سی و دووی ئەوانەی لەسـەر ئیسـلام پەروەردە بـوون لە ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا، لە قۆنـاغی پێگەیشتندا دەستپێوەناگرن، لە کاتێکدا لە سەدا هەژدەیان هەڵگری هیچ ناسنامەیەکی ئایینی نین".(٦٩)

ئەم ئامـارانە ڕۆشـنایی دەخەنە سـەر یەکێـک لە خەتەرنـاکترین ئەو ئاڵنگارییانەی ڕووبەڕووی موسوڵمانانی ڕۆژئاوا دەبنەوە، ئەویـش پەروەردەی ئیسـلامییە لە کـۆمەڵگە ناموسـوڵمانەکاندا، چـونکە منـداڵ دەکەوێتە نێوان دوو ناسـنامەی دژیەکەوە: ناسنامەی خێزانە موسـوڵمانەکەی و ناسـنامەی کـۆمەڵگە هەڵوەشـاوە بـێ کـۆت و

---

(٦٨) صادم.. أكثر من مليون ونصف مليون مسلم في أوروبا قد يتحولون عن الإسلام! https://shorturl.at/GMTX6

(٦٩) فقدان الدين: لماذا يرتد كثير من المهاجرين المسلمين؟ https://shorturl.at/bgPS8

بەنـدەکەی، کە بەشـێوەیەکی بەرچـاو ناسـنامەی کـۆمەڵایەتیی منداڵەکان دەشێوێنێت؛ هەروەها ئامارەکان ڕاستییەکی دیکەیشمان بـۆ ڕوون دەکەنەوە، ئەویـش بـریتییە لەوەی، کە: ئەوانەی ڕوویـان کردووەتە ئیسلام دوای لێکۆڵینەوە و قەناعەتپێکردنی، زیاتر پێوەی پابەندبوون بە بەراورد بەوانەی لەسەری لەدایک بوون بەبێ ئەوەی لە کـۆمەڵگە و ژینگەکەیانـدا شـتێک بـدۆزنەوە بە ئیسـلامیان ببەسـتێتەوە و هاوکاریـان بێـت، ئەمە مانـای ئەوەیە مەترسـییەکی گەورە لەسەر ناسنامەی لەدایکبوانی ئاوارەییدا هەیە؛ هەروەها ئەم مەترسـییە هۆکـاری کـارتێکردنی ژیـنگەی دەوروبەرە، نەوەک پیکدادانی عەقڵی و ئیمانی لەگەڵ ئیسلامدا.

لە لێکـۆڵینەوەیەکی کەنەدیـدا، کە لەسـەر گەنـجە پێگەیشتووەکان ئەنجامدراوە، وای دەبینێت پێکدادان دروست دەبێت لە نێـوان ئەو دوو نەریـتەی منـداڵی کـۆچبەران هەڵیـانگرتوون، ئەمە کاتێ دروست دەبێت دابی کۆمەڵایەتیی ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا نیشـتەجێن پێچەوانەی کلتووری دایـک و باوکیـانە، کە لەسـەری پێگەیشـتوون. بـۆ چارەسـەرکردنی ئەم گـرفتە، منـداڵە پـارچە پارچەبووەکـانی کـۆچبەران دەسـت دەبەن بـۆ دروسـتکردنی ناسـنامەیەکی کـۆمەڵایەتیی دووڕوو، کە یـارمەتیی ڕێکخسـتنی ژیانیان دەدات، لە ماڵەوە بەپێی دابی دایک و باوکیان هەڵسوکەوت دەکەن، لەگەڵ هـاوڕێ و کـۆمەڵگەی دەرەوەیشـدا بەپێـی دابـی کـۆمەڵگەکە دەجـووڵێنەوە[٧٠]، بەتـایبەت ئەگەر ئەو پاڵەپەسـتۆیە

(٧٠) الجيل الثاني من المهاجرين.. سؤال الهوية وتحديات الاندماج. https://shorturl.at/adKTZ

لەبەرچاوبگرین، کە کۆمەڵگە لەسەر منداڵەکانی دروست دەکات، بە هاندانیان بە داماڵین لەگەڵ خۆیدا، یان بە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەگەزپەرستی لە کاتی دوورەپەرێزی و جیاوازبووندا، لەسەرووی ئەمەیشەوە ناشارەزایی ژیانکردنی ئەم منداڵانە و پێویستییان بە ئامادەکردنی کۆمەڵگەیی، کە دایک و باوکیان بەدەستیان گەیشتووە، ئەوکات مەترسیی ئەم کۆمەڵگە ڕۆژئاواییانە بۆ سەر نەوەی نوێی موسوڵمانان دەردەکەوێت.

لە چاوپێکەوتنێکیدا سەکۆی (نون پۆست)، کە لەگەڵ دایکێکی سووری لە کەنەدا ئەنجامی داوە، دایکەکە ئاماژە بە گۆڕانی گەورە دەکات لە هەڵسوکەوتی منداڵەکانیدا و هەستکردنیان بە ناسنامەکەیان لە دوای چەند ساڵێک لە دانیشتنیان لە کەنەدا، لەگەڵ خراپبوونی ئاستی زمانی عەرەبییان، دایکەکە هەستی کردووە کچە بچووکەکەی سەیری لێ دێت دایکی دەست لە گۆشتە حەرامکراوەکان دەپارێزێت، داوای لێ دەکات جلی کورت و ڕووت لەبەر نەکات وەک هاوپۆلەکانی قوتابخانەی، هەموو ئەمە تەنیا لە نەوەی دووەمدا.. چ بگات بە نەوەی سێیەم و دواتر؟!

لە پاڵ ئەم ئاڵنگارییە دژە ئیسلامییانەدا، کە لە کۆمەڵگەی ئەورووپی و دامەزراوە سیاسییە ئەورووپییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، خاڵی جیاواز ئەوەیە موسوڵمانانی کۆمەڵێک لە وڵاتە گەورەکانی ئەورووپا دەگاتە لە سەدا پێنج و لە هەندێکی دیکەدا نزیکی لە سەدا دە!

هەنــدێکیان کۆچیــان کــردووە و نــاتوانن بگەڕێــنەوە بــۆ وڵاتەکانیـان، هەنـدێکی دیکەیـان لە بـنەچەدا ئەورووپـین، ئەمەیـش پێویســتی بە کــاری نــاوخۆیی هەیە بــۆ چارەســەرکردنی ئەو قەیرانانەی ڕووبەڕوویان بووەتەوە.

بۆ نموونە: یەکگرتن لە قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریـدا بـۆ بەرەنگـاربوونەوەی ئەو مەترسییانەی دەوری خۆیـان و منـداڵەکانیانی داوە و دەسـتگرتن بەو دەسخسـتە کۆمەڵایەتییـانەی دەسـتیان کەوتـووە و بەهێزکردنیـان، لەوانە قوتابخـانە و ناوەنـدە ئیسـلامییەکان و دەسـتکەوتی دیـکە. هەروەهـا ڕێکخسـتنی هەماهەنگی لە نێوان جالییە موسوڵمانەکان و تێپەڕاندنی جیاوازییە نەتەوەیی و فیکرییەکان، تا لە توانادا بێت، کەمکردنەوەی گرژی هەڵچوونی کـۆنترۆڵنەکراو، کە دەبێـتە مـایەی زیـادبوونی تێزانـی ناوخۆیی و زیان لە بەرژەوەندیی موسوڵمانان دەدات.

لە کۆتاییـــدا، گەورەتـــرین ڕۆڵ لە پارێزگـــاریکردن لە مسـوڵمانێتیی منـداڵەکان لەسـەر شـانی خـودی خێـزانە، ئەمەیـش پێویستی بە گرنگییەکـی زیـاتری دایـک و بـاوکە کـۆچەرییەکە هەیە بە بەراورد بە دایـــک و باوکێـــک منـــداڵەکانیان لە کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا پێدەگات.[٧١]

هەر لەم بـارەیەوە، کۆمەڵێـک لە بـانگخوازان لە ئەورووپـا دەڵـێن کێشـــەی نەوەی دووەم و ســـێیەمی کـــۆمەڵەی موســـوڵمانان لە ڕۆژئـاوادا، نەبـوونی مەنـهەج و تەکنیکـی پێگەیـاندنی پەروەردەیـی و

---

(٧١) طاهر مهدي البلبلي: تحديات تواجه الأسرة المسلمة في الغرب.

پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیربوون بە ڕۆشنبیریی ئیسلامییە، چونکە ئەو گۆڕانکارییانەی ڕووبەڕووی پێکهاتەی خێزانی کۆچبەر بوونەتەوە لەگەڵ تایبەتمەندی و جیاکەرەوەکانی، وایان کردووە پێویستی بە چاودێری و بایەخێکی زیاترە لە لایەن ئەوانەی بە کاروباری کۆمەڵایەتی هەڵدەستن، بەتایبەت ئەگەر هەڵوەشانەوەی سیستەمی خێزان لە ڕۆژئاوا لەبەرچاوبگرین؛ هەر هەوڵێکی چاکسازی دەبێت بە خێزاندا بڕوات، بە ڕێگەی چارەسەری خۆپارێزیدا، کە خێزان لە درزەکانی کۆمەڵگە دەپارێزێت.

ڕێنموونی، گرنگیی هێشتنەوەی پەیوەندیی میهرەبانی و دۆستایەتییە لە خێزاندا، تاکو منداڵەکان ئاسانتر گوێڕایەڵی ڕێنموونییەکانی باوک و دایک بن و ئەو درزە زەمەنییە کەم بکاتەوە، کە بەربەرەکانێ لە نێوان نەوەکاندا دروست دەکات؛ هەروەها ئاماژە بە گرنگیی پەروەردەکردنی ئیسلامی لە منداڵییەوە دەکرێت بە شێوەیەکی قۆناغبەند، کە لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەدا بگونجێت.

هەموو ئەمانە لەگەڵ یەکگرتنی خێزانە موسوڵمانەکان پێکەوە و بەستنەوەی خێزان بە ناوەندە ئیسلامی و بانگەوازییەکانەوە، کە یارمەتیدەری سازدانی ژینگەی کۆمەڵایەتییە بۆ منداڵەکان، ژینگەی هەڵبژاردەی هاوسەرگیری ئیسلامی لە نێوان نەوەکاندا دابین دەکات؛ هەروەها یارمەتیدەری بەهێزکردنی زەبری ئیسلامییە لە کۆمەڵگەدا، بەتایبەت بە لەبەرچاوگرتنی ڕۆشنبیریی منداڵبوونی ئیسلامی و ڕۆڵی لە پەرەپێدانی دیموگرافیی کۆمەڵگە موسوڵمانەکان لە ڕۆژئاوادا.

لەپێنــاو هەمـــوو ئەمەدا و بە گەڕانەوە بــۆ پێشــبینییەکانی بڵاوبونەوەی ئیسلام لە ئەوروپادا، ئەو بەرپرسیارییەتییەی سەر شانی دایک و باوکە موسوڵمانەکانی ڕۆژئاوایە دەردەکەوێت، هەروەها ئەو ڕۆڵە تەوەرەییەی، کە کەمینە موسوڵمانەکان لە ئەوروپا هەیانە بۆ داهاتووی ئیسلام لەم ولاتانەدا دەردەکەوێت.

بەڵام لەگەڵ ئەم ئاڵنگــارییە باســکراوە و ئەوانەیشـــی بـــاس نەکراون، ئایا دەکرێت بڵاوبوونەوەی ئیسلام، کە بەشێوەی ڕێکخراو لە ئەوروپا و غەیری ئەوروپادا هەیە، سەرکوت بکرێت؟ یان بوونی ئیسلامی توانای بەرگریکردنی لە خۆی و ناسنامەکەیی هەیە؟ ئەی توانای بەرگریکردنی هەیە لە ڕامالینی شەپۆلی کۆمەڵگە؟

# ڕەوشتی جەنگ لە نێوان محەممەد و باوباپیرانی ماکرۆندا

L’insulte est souvent l’aragument final de celui qui ne trouve plus rien à dire.

پەنـدێکی فەڕەنسـیی بەناوبـانگە، واتە: "سـووکایەتی کۆتـا بیانووی دەستی ئەو کەسەیە، کە هیچی بۆ وتن بەدەستەوە نەماوە!"

عەرەبـیش دەڵـێن: رَمَتْنِي بِدَائِهَا وانْسَلَّتَ! واتە: "تۆمەتێکی بۆ دروست کردم و خۆی ون کرد!"

(فرۆشـیاری قسـە) ئیمانوێل مـاکرۆن هـاتە سـەر مینـبەر، تـاکو وانەمان پێ دابداتەوە دەربارەی قەیرانـی ئیسـلام و ئـازادی و تیـرۆر و پشـتگیریکردنی ئەو کاریکـاتێرانەی لە نرخـی پێغەمـبەر (درووودی خـوای لەسـەر بێـت) کەم دەکەنەوە، ئایـا بە ڕاسـت ئەم سـەرۆکە ئەورووپییـە لە قەیرانەکـانی خـۆی و وڵاتەکەی بـووەتەوە، تـاکو بێـت وانە لەسەر قەیرانی ئەوانی دیکە بڵێتەوە؟!

با بە خێرایی باسێک لەم بارەوە بخەینە ڕوو..

## ئەگەر شەرمت نەکرد، هەرچی دەکەیت بیکە

مـاکرۆن - وتـاربێژی ئازادییەکـان - هەمیشـە چاوپۆشـیی لەو

داوایـانە دەکـرد، کە داوای لـێ دەکەن وڵاتەکەی لە سەرانسـەری دونیـادا چەک بەو کەسانە نەفرۆشێت، کە بۆ کوشتنی هاووڵاتی بەکاری دەهێنن.[72]

بەڵکو خودی ماکرۆن بوو لە لووتکەی ئەورووپیدا لە نۆڤێمبەری (٢٠١٧ی زایینـی)دا پشـتگیریی لەو گرێبەسـتانەی چەکـی وڵاتەکەی دەکـرد، کە واژووی کـردووە، ئەو چەکـانەی بە ڕووی بێتاوانەکانـدا بەرز دەکـرێنەوە، کە لەم سـاڵانەی کۆتاییـدا بەهـۆی چەکی فەڕەنسییەوە نزیکەی سێ ملیۆن و سێ سەد هەزار کەس ئـاوارە بـوون، لە کاتێکـدا بیست و چـوار ملیـۆن و سەد هەزار کەس پێویسـتییان بە هاوکـاریـیە، بەپێـی ئامارەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکان.[73]

کەواتە ئەوەی لای یەکەم پیاوی فەڕەنسا گرنگ نییە بریتییە لە پاراستنی ئازادی و ژیانی خەڵکی، بەڵکو گرنگ پارە و بازاڕە، ئەگەر خـوێنی سـەدان کەسـیش بەهـۆی چەکـی وڵاتەکەیەوە بڕژێن![74]

لە مـاکرۆن دەپرسـین: ئەو کـاتەی باسـی ئـازادی و تیـرۆر و قەیرانی ئیسلامی دەکرد، ئەمەی لە بیر بوو؟!

---

(٧٢) الرئيس الفرنسي يدافع عن بيع الأسلحة للسعودية والإمارات مؤكدا حصوله على (ضمانات). https://shorturl.at/kP015

(٧٣) وثائق عسكرية سرية تفضح حجم الدعم الفرنسي للسعودية والإمارات في حرب اليمن.https://shorturl.at/qV567

(٧٤) وثيقة سرية: سلاح فرنسا يفتك بالمدنيين في اليمن.https://shorturl.at/grE79

لە هەمان کاتدا، ماوەی سەرۆکایەتیی سەرۆکی فەڕەنسا بەرەو کۆتایی دەڕوات، هەشتەم سەرۆکی فەڕەنسایە لەوەتەی جەزائیریان داگیرکردووە، بەڵام جەزائیر - تا ئەمڕۆ - تەنانەت داوای لێبوردنێکیشی لێ نەکراوە لە لایەن ماکرۆنەوە - یان هەر سەرۆکێک لە سەرۆکەکانی ئیلیزێی پێش ئەو - لە سەر ئەو هەموو قەسابخانە تیرۆرستییانەی بەدەستی فەڕەنسییەکان لە ماوەی سەد و سی و دوو ساڵ لە داگیرکاریی نیشتەجێکردن ئەنجام درا! ئەو داوای لێبوردنەوەی، کە جەزائیرییەکان بێسڵەمینەوە هەوڵی بۆ دەدەن لە سەردەمی دیگۆلەوە، تا ماکرۆن![(٧٥)]

بابەتەکە تەنیا داوای لێبوردنی فەڕەنسا نییە لە بارەی مێژووی داگیرکارییەوە، بەڵکو بابەتەکە ژیانە لە ژێر سێبەری مەزنڕاگرتنی ئەم مێژووە داگیرکارییەدا. هەر خودی ماکرۆن بوو پێش دوو ساڵ ڕێزی لە (بزاڤی جەزائیرییەکان) گرت، کە دەستەیەک بوون لە جەزائیرییەکان لەگەڵ سوپای فەڕەنسیدا بەشداری کۆمەڵکوژیی براکانی خۆیانیان کردبوو، ماکرۆن بەرزترین مەدالیای دەوڵەتی پێ بەخشین.[(٧٦)]

ماکرۆن وەستاوە، تا تانە و تەشەر لە ئیسلام بگرێت و پشتگیریی ئازادیی سووکایەتی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بکات و لە پشتییەوە ئاڵای فەڕەنسا بشەکێتەوە، کە

---

(٧٥) ماكرون يكرم الجزائرين الذين قاتلوا مع فرنسا ضد بلادهم.https://shorturl.at/eSV08

(٧٦) من هم الحركيون الذين كرمهم ماكرون ويعتبرهم الجزائريون خونة؟https://shorturl.at/hnO28

سوورەکەی ئاماژەیە بۆ خوێنی ملیۆنان مرۆڤ لە سەرانسەری دونیادا و سپییەکەی ڕەگەزپەرستیی سپیپێستی فەڕەنسییە و شینەکەی ڕووباری شین و بیری شەهیدانە، کە لاشەی سەدان جەزائیریی ئاشتیخوازی تێفڕێدران.

## جەنگ لە نێوان پێغەمبەری ئیسلام و فەڕەنسادا

دەیان کاتژمێر بەشی باسکردنی تاوانەکانی فەڕەنسای ڕۆشناییەکان ناکات!

با جارێ واز لە تاوانەکانی بهێنین و سەیرێکی پێغەمبەری ئیسلام و ڕەوشتی لە جەنگدا بکەین. ئەو جەنگەی فەڕەنسا باش پێی ئاشنایە، بەڵام هێشتا ئاشنا نییە بە ڕەوشتەکانی موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) لە جەنگدا.

کاتێ بە پەیامبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وترا: (ادعُ على المشركين) قالَ: (إني لَمْ أُبْعَثْ لَعّانًا، وإنمَا بُعثتُ رَحْمَةً)[٧٧] واتە: "دوعا و لەعنەت لە موشریکەکان بکە". فەرمووی: "من بۆ لەعنەتکردن نەنێردراوم، بەڵکو بۆ ڕەحمەت هاتووم". ئەمە دوای ئەوەی ئازاریان دابوو!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە سوپاکەی پێش ئەوەی بۆ شەڕ بەڕێکەون فەرموو: (وأصلِحوا وأحسِنوا إن الله يحبُّ

(٧٧) سەحیحی موسلیم: ٢٥٩٩.

المحســـنين)[٧٨] واتە: "چاکسازی بـکەن و چـاکە بـکەن، چـونکە خـــوای گەورە چاکەکـــارانی خـــۆش دەوێـــت". ئایـــا فەڕەنســـا بە سەربازەکانی دەڵێت: "چاکسازی بکەن و چاکە بکەن، خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت؟!"

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەتحی مەککەی کرد و دەستی زاڵ بوو بەسەر دانیشتوانەکەیدا، ئەو دانیشتوانانەی خۆی و هاوەڵانییان ئازار دا بە گاڵتەپێکردن و درۆهەڵبەستن و ئەشکەنجە و ئابلۆقە و برسیکردن و دەرکردن و کوشتن. پاشان لێیان خۆش بوو و ئاساییشی بۆ فەراهەم کردن، بەڵکو دوعای بۆ ئەوانەیش دەکرد دوژمنایەتییـان دەکـرد. ئەی فەڕەنسـا چـی کـرد بـۆ تاوانەکـانی بەرامـبەر گەلانـی سەرزەوی، تـاکو سەرۆکە بچووکەکەی لەبارەی ئازادی و تیرۆر و قەیرانی ئیسلامەوە بدوێت؟!

دیمەنێکـی دیـکەی پێغەمـبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) کاتێـک خالیـدی کـوڕی وەلیـدی نـارد بـۆ لای گەلێکـی هاوبەشپەرسـت ئەویـش بە هەڵە کـۆمەڵێکی بێتـاوانی کوشـت، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (اللهـم إني أبـرأُ إليك مما صنعَ خالد)[٧٩] واتە: "خوایە! ئەستۆپاکی ئەوەت لا دەکەم، کە خالید کردوویەتی".

ئەمە هەڵسوکەوتی پێغەمبەرەکەمان (دروودی خوای لەسەر بێت) بـوو لە بەرامـبەر گەورەتـرین سـەرکردەی سـەربازیی خۆیـدا بـۆ

(٧٨) سونەنی ئەبو داوود: ٢٦١٤.
(٧٩) سەحیحی بوخاری ٤٣٣٩.

هەڵەیەک، کە بێمەبەست ئەنجامی دابوو. ئایا فەرەنسا ئامادەیە هەمان شت بەرامبەر سەرکردە سەربازییەکانی بکات، کە - بەپێچەوانەی خالیدەوە - خوێنرێژ بوون، چێژیان لە کوشتن دەبینی و بەمەبەست قەڵاچۆ و وێرانکارییان دەکرد؟ یان لە کۆڵانەکانی پاریسدا پەیکەریان بۆ دروست دەکات؟!

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەجەنگا، زیاد لە شەست جەنگی ئەنجامداوە، لە هەموو ئەو جەنگانەدا تەنیا نزیکەی هەزار کەس لە لەشکری دوژمنانی کوژران، کە لە سەدا یەکی ئەو سوپایانەی پێکدەهێنا![80]

جەنگەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بەرگریکردن بوو لە کۆتا بیروباوەڕ، تاکو لەم گەردوونەدا شوێنێک بۆ ئەم دینە خاتیمە بکاتەوە، چونکە ڕاستی پێویستی بە هێزێکە، تا بیپارێزێت. جا لەبەر ئەوەی ئامانجی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لەم جەنگانەدا میهرەبانی و ڕێنیشاندان و ژیاندنەوە بوو، سووتاندن بە ئاگر و سووکایەتی بە تەرمی قەدەغە کردبوو، بە سەربازەکانی دەفەرموو: (اغْزوا باسم الله، وفي سبيل الله، وقاتلوا مَن كَفَرَ بالله، اغزوا، ولاتَغدروا، ولاتغُلُّوا، ولاتمُثّلوا. لا تَقتلوا شيخًا فانيًا، ولا طفلًا، ولا امرأةً، ولا أصحابَ الصوامع).[81] واتە: "بە ناوی خوا و لەبەر خوا هێرشبەرن، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کوفریان بە خوا کردووە، بجەنگن و غەدر مەکەن و زیادەڕەوی مەکەن، سووکایەتی

(٨٠) اخلاقيات الحروب في السنة النبوية لراغب السرجاني.

(٨١) سەحیحی موسلیم: ١٧٣١. سوننەنی ئەبوداود: ٢٦١٤. موسنەدی ئیمام ئەحمەد: ٢٧٢٨.

بە لاشـــەی مـــردوو مەکەن. پیـــر و منـــداڵ و ژن و ئەو کەســـانە مەکوژن، کە لەنێو پەرستگەکاندان".

پێغەمـبەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) فەرمـانی دەکـرد بە چاکەکردن لەگەڵ دیلدا و خۆیشی چاکەکار بوو لەگەڵیان، هانی پارێزگـاریکردنی لە ناموسـوڵمانە هاوپەیمانەکـان دەدا و دەیفەرمـوو: (مَـــن قَتَـــلَ مُعاهَـــداً لَـــمْ يَـــرِحَ رائِحَـــةَ الجَنَّـــة.)[٨٢] واتە: "ئەوەی هاوپەیمانێک بکوژێت، بۆنی بەهەشت ناکات".

پێغەمـبەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ڕێگریـی کـردووە لە کوشتنی منداڵی موشریکان، دەیفەرموو: (ما بـالُ أقْـوام جـاوَزَ بهـم القتلُ اليَومَ حتى قَتَلوا الذُّرِّيَّةَ؟! ألا إنَّ خيارَكم أبناءُ المُشركينَ. ألا لا تَقتُلوا ذُرِّيَّةً، ألا لا تَقتُلـوا ذُرِّيَّـةً، ألا لا تَقتُلـوا ذُرِّيَّـةً). واتە: "بۆچی کۆمەڵێـک کوشـتن تێیانـدا گەیشـتووەتە ئاسـتێک منـداڵیش دەکـوژن؟! دەسـتتان بپـارێزن لە منـداڵی هاوەڵـدانەران. دەی منـداڵ مەکوژن، منداڵ مەکوژن، منداڵ مەکوژن".

کاتێـک بیسـتی ژنێـک لە جەنـگەکەدا کـوژراوە، فەرمـووی: (مـا كانَـت هـذه لتُقاتـل). واتە: "نەدەبوو ئەمە بجەنگـایە". هەروەها ڕێگریـی لە هـاوەڵانی کـرد ئـافرەت، یـان کرێگـرتە، یـان بەنـدە بکوژن.[٨٣]

ڕێگیری دەکرد لە جیاکردنەوەی دایـک و منداڵەکەی، کـاتێ

---

(٨٢) سەحیحی بوخاری: ٣١٦٦.

(٨٣) سوننەنی ئەبوداود: ٢٦٦٩.

بیلال (ڕەزای خوای لێ بێت) دوو ئافرەتی دیلی هێنا و بە لای کوژراوەکانیانی تێپەڕاندن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بەسەرزەنشتەوە پێی فەرموو: (أَنُزِعَتْ مِنْكَ الرَّحْمَةُ يَا بِلاَلُ، حِينَ تَمُرُّ بِامْرَأَتَيْنِ عَلَى قَتْلَى رِجَالِهِمَا؟)[٨٤] واتە: "بیلال! ڕەحم لە دڵت هەڵگیراوە، کە ئاوەها ئەم دوو ئافرەتەت هێناوەتە سەر کوژراوەکانیان؟"

ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەر بێت) دەڕۆیشت، ئەوەتا بە (یزید)ی کوڕی (ابوسفیان)ی سەرکردەی ئەو سوپایەی بۆ شامی دەنێرێت، دەفەرموێت: ( إنكَ ستجدُ قوما زعمُوا أنهم حبسوا أنفسهُم لله عز وجل، فذرهُم وما زعموا أنهم حبسوا أنفسهُم له، لا تقتلنّ امرأةً، ولا صبيًا، ولا كبيرا هرمًا، ولا تقطعنّ شجرا مثمرا، ولا تُخربنّ عامرا، ولا تَعقرنّ شاةً ولا بعيرا إلا لمأكلة، ولا تَحرقنّ نخلا، ولا تُغرقنّهُ، ولا تُغلّلْ ولا تجبن).

واتە: (کەسانێکت دێتە ڕێ لافی ئەوە لێدەدەن لەبەر خوا خۆیان دابڕیوە لە دونیا، دەی تۆیش وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەوەی لافی پێوە لێدەدەن، ژن و منداڵ و پیری پەککەوتە مەکوژە، داری بەردار مەبڕەوە، ئاوەدانی مەڕووخێنە. مەڕ و وشتر سەرمەبڕە بۆ خواردن نەبێت، دارخورما مەسووتێنە، غەرقیان مەکە و ترسنۆک مەبە).

رمَتْنِي بدائِها وانْسَلَّت

(٨٤) سیرەی نەبەوی: ئیبن هیشام.

دەپرسین: ئایا فەڕەنسا ڕەوشتێکی وەک ڕەوشتی موحەممەدی، لە سەرانسەری مێژووەکەیدا دەدۆزێتەوە؟!

باوباپیرانی ماکرۆن جگە لە خوێن و ئازار و قەلاچۆکردن، هیچی دیکەیان بەدەستەوەیە؟!

فەڕەنسا وەستایی پەیداکردووە لە شێوە جۆراوجۆرەکانی ئەشکەنجەی دڕندانە و زەبوونکردنی دیل و سووکایەتیکردن بە لاشەی مردوودا، جیاوازیی نەکردووە لە نێوان دانیشتوو و جەنگاوەر، یان ئافرەت و پیاو، یان گەنج و منداڵ و پیردا.[٨٥]

ئایا ئەمە ئازادیی فەڕەنسایە؟!

باشتر نەبوو بۆ ماکرۆن هەست بە شەرمەزاری بکات لە کردەوەکانی فەڕەنسا و داوای لێبوردن بکات، پێش ئەوەی بێت ئازادی بداتە ڕۆژنامەکانی، یان پشتگیری، یان بەشداری لە دەستبردن بۆ سووکایەتیکردن بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بکات؟!

پێش ئەوەی بێت باسی وڵاتانی موسوڵمانان بکات، ئەو وڵاتانەی خەڵکەکەیانیان کۆمەڵکوژ کرد، بەروبوومەکانیان تاڵان کرد و تۆوی فەقیری و نەزانییان تێدا چاندن و هێشتایش هەر بەردەوامن!

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕاستی فەرمووە:

(٨٥) متحف الانسان..حيث تتباهى فرنسى بعرض جماجم ثوار مستعمراتها السابقة. https://shorturl.at/gNWX1

(ئەگەر شەرمت نەکرد، ئەوەی دەتەوێت بیکە).

## بازرگـــانی بە لاشـــەوە، دۆزەخـــی منـــداڵ لە کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوادا

لە شەوێکی درێژی شەوە خوێناوییەکانی حەلەبدا، کە دەنگی مەرگ لە هەر چوارلایانەوە بەرزدەبێتەوە و بەرمیلی تەقەمەنی وەک بارینی باران بەسەریان دەبارێنرێت، (دیاب تەلال)ی باوک لەگەڵ هاوســەر و منداڵەکانیــدا دانیشــتبوون بە هیــوای ئەوەی تۆزێــک ئەمنییەت و ئاسایش بەدەست بهێنن، تا ئەو کاتەی موشەکێکی وێڵ بووە میوانی ماڵەکەیان و دەستی باوکەکەی بریندار کرد و خێزانەکەی خستە ژێر مەترسیی لەناوچوونەوە، باوکەکەیش خۆی لەبەردەم هەڵاتنی ناچاریدا بینییەوە بە خێزانەکەیەوە.

لە حەلەبەوە بــۆ لوبنــان و لەوێیشــەوە بــۆ ســوید، بــاوک و هاوســەرەکە و چــوار منــداڵەکەیان خۆیــان لە وڵاتێکــی ئەوروپیــدا بینییــەوە، کە نە زمــانەکەی دەزانــن و نە بە چۆنییەتیی ژیــانکردن تێیدا ئاشنان. لە پاڵ قورسییەکانی ژیان و کێشەکانی تێکەڵبوون لەگەڵ کۆمەڵگەدا، دایک و باوکەکە کاتێ بە خۆیــان دەزانــن یەکێــک لە دراوســێکانیان ڕێکخــراوی سۆســیالی ســویدی ئاگادارکردووەتەوە لە مەترسی و ناشایستەیی ئەم دایک و باوکە

بە پەروەردەی منـــداڵەکانیان[٨٦]، دایـــک و بـــاوکەکە دەبیـــنن ڕێکخـــراوی کاروبـــاری کـــۆمەڵایەتی - سۆســـیال - هەر چـــوار منـداڵەکەیان لە ژێـر چنـگ دەردەهێـنن و بە بیـانووی ئەنجامـدانی تونـدوتیژی لە بەرامبەریـان و ناشایسـتەیی بـۆ پەروەردەکردنیـان، لە دوای مانــگ و نیوێــک لە هێنــان و بــردن، نە دەســەڵات تــوانیی بیســـەلمێنێت ئەم منـــداڵانە تونـــدوتیژییان بەرامـــبەر کـــراوە، نە نەخۆشخانە هیچ شوێنەوارێکی لێدانی لەسەر لاشەی منداڵەکانی دۆزییەوە.

تەنانەت پسپۆڕی دەروونی تێکچوونی باری دەروونیی دایکەکەی بەدرۆخستەوە، دوای هەموو ئەمانە باوکەکە خۆی لە ژێر تۆمەتی ڕەزیلیـدا بینیـیەوە و بیـانوویەکی بەس بـوو بـۆ ئەوەی بەخێـوکردنی منـداڵەکانیان لـێ بسـەنرێتەوە، لەگەڵ هەمـوو ئەو لیسـتی نرخـانەی بـــاوکەکە پێشکەشـــی کـــردن، تـــا بەخشـــندەیی و دەســـبڵاوی و سـەرفرکردن بـۆ منـداڵەکانی بسـەلمێنێت، بەڵام دادگـا هەر بڕیـاری لێســـەندنەوەی منـــداڵەکانی دا و تەنیـــا ڕێـــی ئەوەی بە دایـــک و باوکەکە دا هەموو مانگێک یەک سەعات بیانبینن! بەپێی قسەی بـاوکەکە تەنـانەت ئەوەیشـیان پـێ ڕەوا نەبینـرا، دایـک و بـاوکەکە منـداڵەکانیان لە ژێـر بـاڵی خێزانێکـی سـویدیدا بینیـیەوە، کە هەر ناشـیەڵن بیـانبینن. هەمـوو ئەمـانە بە بیـانووی پارێزگـاریکردن لە منداڵەکان!

ئایا جیهانی ڕۆژئاوا ڕاستگۆیە لەم لافلێدانەیدا؟

---

(٨٦) حتى الجنين في بطن أمه.. عائلة سورية (السوسيال) السويدي من أطفالها.
https://shorturl.at/DEQVW

ئایا هەر بەڕاستی منداڵەکان دەپارێزرێت دوای ئەوەی لەدەست دایک و باوکیان دەریاندەهێنن؟

یان ڕوویەکی ناشیرین هەیە و لە ڕێی میکیاژەوە دەشاردرێتەوە؟

## لە پشت پەردەوە

لە بیست و چواری سێپتێمبەری (٢٠١٣ی زایینی)دا، سیاسەتمەداری بەئەزموونی سویدی (ئۆفیە سفیدین)، کتێبەکەی بە ناونیشانی (بازرگانیی پڕقازانجی منداڵ) چاپ و بڵاوکردەوە، تێیدا زانیاریی مەترسیداری لەسەر چالاکییەکانی ڕێکخراوی سۆسیالی سویدی درکاند و بڵاوکردەوە، کۆمەڵێک لە سەرکردەکانی دەزگاکەی تۆمەتبار کرد بە بازرگانیکردن بە منداڵ و گێچەڵی سێکسی بە بیانووی پاراستنیان لە توندوتیژی و کەمتەرخەمیی پەروەردەی دایک و باوکەکان؛ نووسەر لە کۆبوونەوەیەکیدا لەگەڵ ئەندامانی حیزبی ناوەندی سویدی بۆی زیاد دەکات و دەڵێت: "سوید لە گەندەڵترین وڵاتەکانی جیهانە".

نووسەر لەم کتێبەدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ماندوونەناسانەی بەدواداچوونی ساڵانێکی دووروودرێژی چالاکییەکانی ڕێکخراوی سۆسیالی سویدی بڵاوکردەوە.

کار گەیشتە ئەوەی ڕێخراوەکە بەبێ زانیاری و ئاگاداریی دایک و باوکەکان، منداڵ لە قوتابخانە دەرفێنێت و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکەن لە دووریی ماڵی خێزانەکەوە، ئەمە سەرباری

گێچەڵی سێکسیی هەندێ لە سەرکردەکانی سۆسیالی سویدی بۆ سەر منداڵەکان. لە کێبەکەیدا بە دەق هاتووە:

(لەگەڵ ویژدانی بەرفراوانی دایک و باوکە هەڵگرەوەکە، بەبێ ڕەزامەندیی دایک و باوکە بایۆلۆجییەکە، دەکرێت دواتر منداڵەکە وەک کارەکەرێکی بێ مووچە لە کێڵگەیەکدا بەکاربێت، یان بفرۆشرێت بە ئالوودەبوانی سێکس یان چێژوەرگرە دەوڵەمەندەکان لە منداڵ، یان وەک کەروێشک لە دروستکردنی پێکهاتەکانی دەرماندا بەکاربهێنرێن).

وەلێ لەگەڵ بەوەلانانی ئەوەی سفیدین دەیلێت، تەنانەت ئەگەر مەترسی سۆسیال لە فڕاندنی منداڵ کورت بکەینەوە بەبێ بازرگانی پێکردنیان، ئایا هەر بەڕاست کۆمەڵگە ڕۆژئاواییە سەردەمییانەکان ژینگەیەکی مرۆڤانە و ئارامن بۆ منداڵ؟

یان بابەتەکە زۆر لە ڕێکخراوی سۆسیال و هاوشێوەکانی تێپەڕی کردووە؟

## منداڵگەلێک لە پەنجەرەی نماییشدا

لە شەشی یۆلیۆی (٢٠١٩ی زایینی)دا، پۆلیسی ئەڵمانی ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆی لە بارەی تاوانەکانی دەستدرێژی بۆ سەر منداڵان بڵاوکردەوە، ڕاپۆرتەکە دەریخست تەنیا لە ماوەی ساڵی (٢٠١٨ی زایینی)دا، نزیکەی چواردە هەزار و نۆ سەد منداڵ لە شارە جیاجیاکانی ئەڵمانیادا ڕووبەڕووی دەستدرێژیی بوونەتەوە. لە

سەدا هەشتایان لە هەشت ساڵ بەرەو سەر بوون[٨٧]، هەموو ئەمە لە سنووری ئەوەی توانراوە لە چوارچێوەی چاودێری و ئامارداية.

بەڵام هەر بەپێی خودی ئاماری پۆلیس ژمارەکە زۆر لەمە زیاترە، چونکە زۆرێک لە دەستدرێژیکردنەکان لە سنووری خێزان و هاورێکاندا ڕوودەدەن، ئەمەیش گەیشتنی بە دەست لێکۆڵەر و ئاگاداربوون لێیان قورستر دەکات. ئەمە وێڕای دەستبەسەراگرتنی ئەم لایەنانە بەسەر زیاتر لە حەوت هەزار و چوار سەد ڤیدیۆی ئابڕووبەرانەی دەستدرێژیکردنە سەر منداڵ.[٨٨]

لەمەش خراپتر و سەرلێشێواوانەتر، لە تاقیکردنەوەی کینتلەردا دەبینین، کە وەک مشکی تاقیگە، خراپترین مامەڵەیان لەگەڵ منداڵە بێلانەکاندا دەکرد[٨٩]، کاتێ لەم تاقیکردنەوەدا سەرپەرشتیارانی تاقیکردنەوەکە بۆ ماوەی سی ساڵ منداڵی بێلانەیان لەگەڵ منالباز (پیدۆفیلیا)دا نیشتەجێ دەکرد، ئەمە بۆ تاقیکردنەوەی ئەوەی ئایا ئەم لادەرانە تا چەنێک دەتوانن باوکێکی باش بن؟!

ئەمە وەک ئەوە وایە پارچە گۆشتێک بخەیتە بەردەم دڕندەیەک، بۆ ئەوەی توانای خۆگرتن و بەرگەگرتنی تاقی بکەیتەوە!

---

(87) Germany registers shocking number of child abuse cases. https://shorturl.at/egix1

(٨٨) سەرچاوەی پێشوو.

(89) Berlin authorities placed children with pedophiles for 30 years. https://shorturl.at/FVWZ1

لە ئەوروپاوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، لێکۆڵینەوەیەک، کە سەنتەری لێکۆڵینەوەکان بۆ تاوان دژی منداڵ ئامادەی کردبوو، دەڵێت: "لە ئەمەریکا لە هەموو پێنج کچێک، یەکێکیان ڕووبەڕووی شێوەیەک لە شێوەکانی گێچەڵ بووەتەوە، لە کاتێکدا لە کۆی هەموو بیست منداڵێک یەکێکیان تووشی گێچەڵی لەم شێوە بووەتەوە".[(٩٠)]

هەمان سەنتەر لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا دەڵێت: "لە سەدا شانزەی گەنجان لە کوڕ و کچ لە نێوان چواردە بۆ حەڤدەساڵیدا ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە، تا دەگاتە ئاستی دەستدرێژیی سێکسی". ئەمانە وامان لێ دەکەن لەم جیهانە پێشکەتووە بەسۆزەی، کە منداڵ لە دایک و باوک دەرفێنێت گوایە بۆ پاراستنیان، بپرسین: ئەوە باسی چ پاراستنێک دەکەن؟!!

## ئێستا با پەردەکە هەڵدەینەوە

لە پێنجی فێبرایەری ساڵی (٢٠١٨ی زایینی)دا، زانکۆی (فرۆستبۆرگ)ی ئەڵمانی نمایشێکی بۆ سەکۆی (TEDx) ئەنجامدا، تێیدا کچێکی خوێندکار بەناوی (میرجام هینی) بابەتێکی لەسەر (منداڵبازی، یان پیدۆفیلیا) پێشکەش کرد.[(٩١)]

پێش ئەوەی مێشکت بچێت بۆ ئاراستە ئاساییەکە و وا بزانیت

(90) Child Sexual Abuse Statistics. https://shorturl.at/inX9
(91) Did a TEDx speaker say Pedophilia Is an 'Unchangable Sexual Orientation? https://shorturl.at/dHQR1

هینی وەستاوە و دژایەتیی ئەم کارە و ڕەوشتە دڕندانەی کردبێت، با لە خەیاڵاتە پەمەییەکانت بتهێنینە دەرەوە و سەرت بسووڕمێنین، هینی وتارەکەی بەم ناونیشانە بوو: (بۆچی دەبێت ڕوانینمان بۆ منداڵبازی بگۆڕێت؟)

بەڵام بۆ جوانکردنی وێنەکە، هینی ئاماژەی بەوە دا، کە منداڵبازی بە کارێکی خراپ و دڕندانە دەزانێت، بەڵام لە هەمان کاتدا دەڵێت: "ئەو کەسانەی حەزیان بە ئەنجامدانی سێکسە لەگەڵ منداڵی بچووکدا تووشی لادانێکی سروشتی بوون، کە تاوانی خۆیانی تێدا نییە، هەر لە منداڵییانەوە بەو شێوە دروست بوون". دەتوانین بەم هەوڵە بڵێین ڕەواجدانێکی شاراوە بۆ ئەم لادانە جنسییە، بەڵام ئەم ڕەواجدانە لەم چەند خولەکەدا کورت نابێتەوە، کە خوێندکارێکی پزیشکی لە زانکۆی فۆرستبۆرگ پێشکەشی کرد، بەڵکو ئەم ڕەواجدانە بە قۆستنەوەی منداڵ و دەستدرێژیکردنە سەر منداڵێتییان لە لایەن ڕێکخراوگەلێکەوە سپۆنسەر دەکرێت، کە بە حساب لەپێناو پاراستنی منداڵدا دروست بوون. ڕێکخراوی (Prostasia)ی ئەمریکی لە وێبسایتی سەرەکییان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە تایبەتمەندە بە پاراستنی منداڵ، درووشمێکی زۆر سەیری هەڵگرتووە: (کۆکردنەوە لە نێوان سەرکۆنەکردنی دەستبردنی سێکسی بۆ منداڵ و ڕێزگرتنی هەموو مەیلە سێکسییەکان) پێکەوە، لە یەک چوارچێوەدا!!

بەڵام ئەم شڵەژانە لە درووشمدا نامۆ نییە بە درووشمە ڕۆژئاواییەکان، کە نزیکە بانگەشە بۆ هەموو شتێک دەکەن. لە درووشم تێدەپەڕێت و ڕێکخراوەکە لە یەکێک لە بابەتە

ڕەسمییەکانیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە منداڵبازی سووکایەتی نییە، دەڵێت: "حەزی سێکسی بۆ منداڵ، تەنیا ویستێکی بێتاوانانەی خاوەنەکەیەتی و هەموان قەبووڵیان کردووە وەک ڕوانین و هەستێکی بێبەها".[92]

هەروەها ڕێکخراوەکە دەڵێت پێناسەی ڕاست و دروستی منداڵبازی بریتییە لە: (کەسێک کەمێک مەیلی بۆ منداڵ هەیە Minor Attracted person) یان (MAP) وەک ڕێکخراوەکە دەڵێت ناونانێکی ناسکانەیە بۆ پاراستنی لایەنی دەروونی ئەم جۆرە کەسانە).[93] هەموو ئەمانە لە وارگەی ڕێکخراوێکی تایبەت بە پاراستنی منداڵدایە!

بەڵام بۆ هێورکردنەوەی ویژدان، ڕێکخراوەکە دەڵێت: "ئەو چارەسەرەی ئەگەری پاراستنی منداڵی هەیە لە قۆستنەوەی جنسی بریتییە لە بەیاساییکردنی فرۆشتنی بووکەڵەی پلاستیکیی سێکسیی هاوشێوەی منداڵان، بۆ ئەوەی ببێتە جێگرەوەیەک بۆ ئەو لادەرانە".[94]

لەوە مەترسیدارتر دامەزرێنەرانی ڕێکخراوەکە داوای هەڵگرتنی قەدەغەی سەر ئەو ماددە ئیباحییانە دەکەن، کە لاسایی سێکسیی منداڵان دەکەنەوە و داوای ڕێگەدان بە بڵاوکردنەوەی دەکەن وەک جێگرەوەیەک بۆ ئەو کەسانەی حەزیان بۆ منداڵ دەجووڵێت، ئەمە

(92) Exposing the Dangerous Movement to Normalize Pedophilia as a Sexual Orientation. https://shorturl.at/hPQS5
(93) Stop using <<pedophile>> as an insult. https://shorturl.at/dhnqy
(94) Our campaigns against doll bans. https://shorturl.at/CEGJT

سەرباری حەزیان بۆ سڕینەوەی لیستی تاوانبارانی دەستدرێژیکارانی سەر منداڵان[٩٦]، سەرمان لەم کارە ناسوورمێت، ئەگەر بزانین یەکێک لە کارمەندانی ئەم ڕێکخراوە (گای هاملتۆن سمیس Guy Hamilton-Smith تاوانبارکراوە بە هەڵگرتنی ماددەی سێکسیی تایبەت بە منداڵان!)

ئەو کەسەی داوای وەرگرتنی مۆڵەتی پارێزەری ڕەتکرایەوە، چونکە تاوانی سێکسیی لەسەر تۆمارکراوە، لە کاتێکدا لە ڕێکخراوێکدا دامەزرێنراوە، کە کاری پاراستن و گرنگیدانە بە منداڵ![٩٨]

دوای هەموو ئەمانە... دەگەڕێینەوە بۆ سەر بەسەرهاتەکەی یەکەممان، کە نموونەیە بۆ هەزاران چیرۆکی ساڵانە دووبارەبووەوە لە بارەی ڕفاندنی منداڵ لە خێزانەکانیان بە بیانووی پاراستنیان، تاکو شۆک ببین بەوەی ئەم منداڵانە پێویستیان بە پاراستنە لە شتێکی گەورەتر، بەڵکو پێویستییان بە پاراستنە لەو ڕێکخراوانەی زۆرجار لافی پاراستنیان لێ دەدەن. ئەوەی پەردە هەڵدەداتەوە لەسەر یەکێک لە ناشرینترین ڕووەکانی ناپێوەریی ڕۆژئاوا، دارمانی ڕەوشتی خۆجوانکەر بە بانگەشەکانی عەلمانییەت و ئازادییەکانە. ئەوەیش دەمانخاتە بەر پرسینەوە لە چارەنووسی ئەم منداڵانە لە ژێر سێبەری دارمانی ئەخلاقی و داڕووخانی بەهاکاندا، کە وای لێ هاتووە بانگەشە بۆ هەموو گومڕایی و لادانێک دەکات.

---

(96) Is censoring onlin porn the best way to keep children safe? https://shortyrl.at/cnVW8

(98) Sex offender seeks admission to Kentucky bar. https://shorturl.at/frJ12

# ڕەوشتی ناڕەوشتی..

# فەیسبووک بۆچی بلۆکمان دەکات؟!

ئێسا بڕۆ و کۆمێنتێک لەسەر پۆستێک بنووسە، لە تەنیشت لاکێشەی کۆمێنتەکەوە دەستەواژەیەک دەبینیت:

(پێوانەکانی کۆمەڵگەکە)، کە دەبێت زۆر بەئەدەبەوە پابەندی بیت، ئەگینا بێتاقەت مەبە، ئەگەر ئەکاونتەکەت بلۆک بکرێت، یان هەر لەبنەڕەتەوە بسڕدرێتەوە.

لۆژیکییە بپرسیت: کامە پێوانە؟!

ئەوکات هەموو ئەو کاتانەت بیر دەکەوێتەوە، کە لە جیاتی پیتێک ئەستێرەیەک، یان پیتێکی ئینگلیزیت لە شوێنی پیتە کوردی، یان عەرەبییەکە داناوە بۆ ئەوەی لە چاودێری و پێوانە بێکۆتا و توندەکانی وارگەکە دەربازت بێت. ئەگەر فراوانتر بڕوانین، ئەوا دەبینین ئەم وارگەیە، یان هەر یەکێک لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی تر تەنیا نین لە دانانی ئەم پێوانانەدا. سینەما و تەلەفیزیۆن و سەکۆ میدیاییەکان پێش ئەمان پێوانەی خۆیانیان دیاری کردبوو، گوتاری پۆست مۆدێرنیزم - بەگشتی - ئەرکی پەروەردەکردنی کۆمەڵگەی بەپێی پێوانی نوێ خستووەتە سەرشانی خۆی، تاکەکان ئازادن هەرچەند لادەدەن، هەموو ئاراستەیەک

مافی بوونی هەیە؛ هەموانیش دەبێت ڕێزی بگرن، نەک هەر ئەمە دەبێت بەو شێوەی خاوەنەکانی دەستەواژەکانیان پێناسە دەکەن، خەڵکیش دەبێت هەر بەو شێوە پێناسەیان بکەن، هەرچەندە پێچەوانەی لۆژیک و سروشت و فیترەتیش بێت؛ هەرچەندە مافخۆر و ستەمکارانەیش بێت بۆ خاوەنەکانی، ئەمە ئەو ڕاستییانەیە کۆمەڵگە دەبێت پابەند بێت پێیانەوە!

## بڵێ و مەڵێ

لە نوێکردنەوەیەکی چاوەڕوانکراودا، ئەکادیمیای هونەر و زانستەکانی وێنەی جووڵاو – ئەوەی خەڵاتی ئۆسکار دەبەخشێت – کۆمەڵێک مەرجی نوێی خستە ڕوو بۆ ئەوەی فیلمەکە بخرێتە لیستی پاڵاوتنی خەڵاتەکەوە، لەنێو ئەو مەرجانەدا: دەبێت فیلمەکە بە لایەنی کەمەوە ڕۆڵێکی سەرەکیی تێدا بێت نوێنەرایەتیی یەکێک لەو کەمینانە بکات، کە بەپێی پێویست نوێنەرایەتی ناکرێن، یان لانیکەم لە سەدا سی ڕۆڵە لاوەکییەکان لە لایەن دوو کۆمەڵەوە بێت، کە بەپێی پێویست نوێنەرایەتی ناکرێن، یان چیرۆکی سەرەکیی فیلمەکە دەربارەی یەکێک لەو کۆمەڵانە بێت، وەک: پێستی ڕەنگاوڕەنگ و خاوەنپێداویستی تایبەت و ژن و هاوڕەگەزباز و ڕەگەزگۆڕ و جگە لەمانە...

هەموو ئەمانە کەمینەگەلێکن دەبێت فیلمەکە لەخۆیان بگرێت بۆ ئەوەی بچێتە ناو پێشبڕکێکاران لەسەر ئۆسکار، بەڵکو لەوە زیاتریش؛ دەبێت ئەم فرەییە درێژببێتەوە بۆ ئەوانەی لە پشت کامێراوەن، دەبێت ستافی کارکردن لە یەک ڕەنگ و ڕەگەز و

تەنانەت یەک مەیلی سێکسیدا کورت نەبێتەوە. وەک وتمان ئەم نوێکردنەوەیە لەناکاو نەبوو، پێش نیو سەدە و بەدیاریکراوی لە ساڵی هەزار و نۆ سەد و هەشتا و شەش (١٩٨٦ز)دا، کۆمپانیای (یەکگرتنی هونەرمەندان) یانزە فیلمی وێنەی جووڵاوی دیاری کرد لە نێوان ساڵانی سی و چلەکانی سەدەی بیستدا دەرچوون، بەڵام یان ڕێگری کرا لە بڵاوکردنەوەیان؛ یان دەرکردنی بەشی نوێیان لێ قەدەغە کرا بە بیانووی نەگونجانی بۆ پەخشکردن، چونکە وێنەیەکی نەمەتی کەمینە ڕەگەزی و ڕەنگییەکانی نیشان دەدا، یان سادەتر بڵێین: لەبەر ئەوەی پێچەوانەی پێوەرە دروستییە سیاسییەکان بوون.

فەرهەنگی بەریتانی بۆ زانیاری پێناسەی دەکات بەوەی بەکارهێنانی زمانێکی جوانە و لووسە لە دواندا، بەڵام ڕێژەیەکی زۆری سووکایەتی و لایەنگریی لە ناخیدا هەڵگرتووە، بەتایبەت لە کاتی وەسفکردنی کۆمەڵێک لە خەڵک لەسەر بنەمای هۆیەکی دەرەکی لە دەرەوەی دەسەڵاتی خۆیانەوە وەک: ناسنامە و ڕەگەز و ئەو ژینگە ڕۆشنبیرییەی تێیدا گەورە بووە و لادانی سێکسی. لەگەڵ هەموو ئەو ڕێگرییانەی لەخۆی گرتوون دژی ڕەگەزپەرستی و جیاکاری دژی کەمینەکان، بەڵام — لە هەمان کاتدا — ڕێگری دەکات لە ڕەخنەگرتن لە هەموو ئاڕاستەیەکی سێکسی و لادانێکی فیکری، کە پێش ماوەیەکی کەم بەپێی یاسای ڕۆژئاوایی قەدەغەکراو و تاوانبارکراو بوو؛ هەروەها جێی گاڵتەکردن و سووکایەتیپێکردن بوو لە کارە هونەرییەکانی ڕۆژئاوادا.

زنجیرەی ئەمریکیی بەناوبانگی (Friends)، کە لە ماوەی

نێوان ساڵەکانی (١٩٩٤ی زایینی) بۆ (٢٠٠٤ی زایینی)دا پەخش کرا، ڕووبەڕووی هێرشێکی توندی نەوەی گەنجی هەزارەوە بووەوە کاتێ لەم دواییانەدا لە سەکۆی (نێتفلێکس) دووبارە پەخش کرایەوە، چونکە پێچەوانەی دروستییە سیاسییە نوێکراوەکانە، کارەکە تۆمەتبار کرا بەوەی پیاوسالار و ڕەگەزپەرستە و تۆقاندنی خەڵک دژی لادانە سێکسییەکان و دژایەتییان دەکات و سووکایەتییان پێ دەکات.

ئەوەی نیشانی خەڵک دا، کە دروستیی سیاسی چ سنووردارکردنێکی ئازادیی ڕادەربڕین و دیبەیت و دەمەتەقێی تێدایە لە بابەتگەلێکدا کۆی کۆمەڵگە دەگرێتەوە، هێرشت دەکرێتە سەر تەنیا لەبەر ئەوەی دەستەواژەیەکی نەویستراوت بەکارهێناوە، ئیتر بە چاوپۆشیکردن لە ناوەڕۆکی ڕەخنە و لۆژیکیی سکاڵاکە. ئەوەندە بەسە بە هاوڕەگەزبازی بڵێیت (لادانی سێکسی)، تا تۆمەتبارت بکەن بە نەخۆشییەکی دەروونیی نوێ، کە پێی دەوترێت (تۆقانی هاوڕەگەزبازی)، ڕەتکردنەوەی داننانت بە قەوارەیەکی داگیرکەردا و وەسفکردنی بە شتێک لەگەڵ بیروباوەڕتدا یەکدەگرنەوە؛ دەتخاتە بەردەم تۆمەتی دژایەتیکردنی شتێکی مەزن، بۆیە زۆرێک لەوانەی پشتگیری لەم دروستییە دەکەن تۆمەتبار دەکرێن بەوەی (زمانێکیان بینا کردووە دوژمنکارانەترە لەو زمانەی هەوڵی ڕەخنەلێگرتنی دەدەن). کەواتە دروستی لێرەدا هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی جەور و تۆقاندنی نەیاران، وای لێ اتووە دەستی هاوکاری درێژکردنی پیاوێک بۆ ئافرەتێک، تا جانتا قورسەکەی بۆ هەڵبگرێت وەک لە شێوەیەک لە شێوەکانی چەوسانەوەی

بچووککراو سەیر بکرێت، چونکە لە ناخیدا شێوەیەک لە جیاکاریی دژ بە بەرامبەری هەڵگرتووە.[۴۰]

## ئەم شێتییە چییە؟!

زیـــــادبوونی توونـــــدڕەوانەی وتـــــاری ئەم دروســـــتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی بنکۆڵکارانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی (٢٠١٨ی زایینـی)دا دەبینـین، دەڵێـت چـوار لەسـەر پێـنج هەمـوو ئەمـریکییەک وای دەبیـنن دروسـتیی سیاسـی سـنووری تێپەڕانـدووە، ڕەخنەگرتنـی تـاک لە زمـانی بەرامـبەرەکەی و بێزاربـوونی لە ڕەخـنەکە گەیشـتووەتە ئاسـتێکی بێـزارکەر لە هەستیاری و شێتی.

ئەمە وامـان لـێ دەکـات لە بـارەی ئەم ڕەوشـتە دروستکراوانەوە بپرسین، کە لە هەناوی بانگەشەی ئەم دروستییەوە لەدایک بـووە، ئەو ڕەوشـتانەی پشـت بە هـیچ سـەرچاوەیەکی ڕەوشـتی نابەسـتن، بەڵکـو بە دەوری تاکایەتیـدا دەسـووڕێنەوە و پشـتگیریی هەمـوو شـتێک دەکەن مـادام خۆشـی بـۆ خاوەنەکەیـان فەراهەم دەکەن و لەگەڵ ئارەزووەکانیانـدا دەگـونجێن، چەک — بەرامـبەر — هەمـوو ڕەتـکەرەوە و ڕەخنەگرێـک بەرزدەکـاتەوە، کە بەڵـێ، بەڵـێ بـۆ فەرمایشتەکانیان ناکەن.

ئەم ڕەوشتانە لە کوێوە دەستیان پێ کرد و چۆن گەیشتنە ئەم قۆناغە، کە بەسەر هەموو کۆمەڵگەکاندا زاڵ بوون؟!

## پیرۆزی بێ پیرۆزکراو

(دۆستۆیڤسکی) لە ڕۆمانی (برایانی کارامازۆڤ)دا قسە بەناوبانگەکەی لەسەر زمانی (ئیڤان) – یەکێک لە پاڵەوانەکانی ڕۆمانەکە – دەکات و دەڵێت: "ئەگەر خودا بوونی نەبێت، هەموو شتێك ڕێپێدراوە".

ئەو بەڵگەنەویستەی فەلسەفەی ئەخلاقی پێشووی لەسەر بیناکراو و تا ئەمڕۆیش بەردەوامە، تا پیرۆزی هەبێت پێوەرگەلی پیرۆزیش دەبن، ئەو کاتەی پیرۆزەکە نەما، پێوەرەکانیش پیرۆزییەکەیان لەدەست دەدەن. بەڵام فەیلەسوفی فەڕەنسی (ژیل لیبۆفسکی) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (ئاوابوونی ئەرک) دەڵێت: "ئەم بەڵگەنەویستە هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوایەتیی نوێ و دوورخستنەوەی ئایین لە مەیدانی گشتیدا، فێڵی زۆر لێ کراوە. هەر لە سەرەتای سەدەی حەڤدەی زاینییەوە ئەخلاق لە بیروباوەڕی دینی داماڵرابوو و چەمکی (ئەرک) شوێنی گرتبووەوە".

ئەو ئەرکەی هاوشانی پێویستکردنی خوایی نییە، کە ئەنجامدەری پاداشت دەدرێتەوە و وازلێهێنەری سزا دەدرێت، بەڵکو پێویستییەکە مرۆڤ لە گەورەترین ئامانج دەکات، مافێکی پێ دەدات، کە هیچ لەسەریەوە نییە. لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەدا، (جان جاک ڕۆسۆ) لە کتێبی (پەیمانی کۆمەڵایەتی)دا

لەدایک بوونی ئایینی مەدەنیی نوێی ڕاگەیاند؛ بە ئەمەکی و دەستپاکی و دڵسۆزی هەروەک سەدە ئایینییەکان بە مەزنی مانەوە، بەڵام لەگەڵ ڕۆسۆدا ڕووی وەرگێڕا بۆ ئامانجێکی نوێ: (بیناکردنی سیستمێکی سیاسیی ڕێکخراو و ئاشتییانە).

هەرچەندە زایەڵەی ڕەوشت و یاسا مەسیحییەکان هێشتا لە زۆرێک لە ئاستە نوێیەکاندا دەبینرێت، بەڵام جیاوازی بنەڕەتی لەوەدایە ئەم ئەخلاقە نوێیە خۆی دارنی لە هەموو پابەندبوونێکی دینی و دونیایی. ئەرکە ئایینییەکان لە مەیدانی ئایینەوە بۆ ئەرکی تاک و کۆمەڵگە گوازرانەوە، وای لێ هات ئەو گوناهەی خاوەنەکەی لە سزای خوایی دەترسا، بووە نەخۆشی و ناشرینییەک بەهۆیەوە لە ئابڕوچوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەترسا؛ ئەمە قۆناغی (عەلمانییەتی یەکەمە)، کە ئەخلاقی مەسیحی پێیدا تێپەڕ بوو. بەم هەنگاوە، گوتاری ڕۆژئاوایی لەبری بەدیهێنەر، بەرژەوەندیی گشتیی پیرۆز کرد، ئەخلاقی بە ئەرک و سوودی کۆمەڵگەیی پێناسە کرد. هەروەها چونکە گرنگترین شتێک دۆخی ئەورووپیی پێ دەناسرێتەوە ڕاکردنە بەبێ وەستان، شتێکی سروشتی بوو ئەخلاق بگوازرێتەوە بۆ قۆناغی دووەم لە عەلمانییەت: (قۆناغی دارنینی شەرعییەت لە خودی بیرۆکەی ئەخلاق)، وای لێ هات هیچ پێوەرێک بۆ ڕاست و هەڵە نەما، ڕوانین و ویستی خودی تاک نەبێت؛ (نە ئەرک هەیە و نە غەمبار دەبن)، تاک و ویستی بوونە یاسای نوێ، بەم شێوە هەموو ویستراوێک بووە ڕێپێدراو!

## پاش بە ڕەوشتکردن[٩٩]

لە جیاکردنەوەی دوو قۆناغەکەدا، (لیبۆفسکی) پێمان دەڵێت قۆناغی مۆدێرنە - یان قۆناغی یەکەمی عەلمانیەت بۆ ڕەوشت - ڕۆحییەتی کۆمەڵ و ڕێکخستن بەسەریدا زاڵ بوو، بەپێچەوانەوە قۆناغی دووەم بە دەوری تاکدا دەسووڕێتەوە، بۆیە هەڵپەکردن بەشوێن خۆشگوزەرانیی تاکەکەسییەوە زاڵ بوو بەسەر هەموو بەهاکاندا؛ ئەو کاتەی مەراقی مرۆڤ دەبێتە دڵخۆشیی کەسی و وای دەبینێت ئەوە شتەکانن ئەم خۆشییەی بۆ فەراهەم دەکەن، نەک خەڵکەکان، ئەوکات دەست ناپارێزێت لە بەدەستهێنانی زۆترین ڕێژەی ئەم خۆشییە بەبێ گوێدانە هیچ پابەندبوونێکی ڕەوشتی بەرامبەر ئەوانی دیکە.

بۆیە بەم قۆناغە دەڵێت (پاش بەڕەوشتکردن)، نەک (پاش ڕەوشت)، چونکە وشەی (بەڕەوشتکردن) وەسفی باری ڕەوشتی ئەم قۆناغە دەکات، لەم قۆناغەدا سەرچاوەکان ناگۆڕدرێن بە هێشتنەوەی بەها و ڕەوشت وەک قۆناغی پێشتر، بەڵکو ئەم بەهایانە لە ڕەگ و ڕیشەوە دەردەهێنێت و (تاک) وەک تاکە بەها دەهێڵێتەوە. بەڕەوشتکردن زیاتر بە جوانکردن دەچێت، ڕەوشت بوونی نییە، بەڵام خشڵێکی جوانە فریومان دەدات، بۆ ئەوەی وا بزانین سەرچاوەیەک هەیە، بەڵام لەڕاستیدا هەوا و هەوەس هەموو شتێکە.

---

(٩٩) واتە: شتێک خۆی ڕەوشتی (ئەخلاقی) نییە و بەزۆر بە ڕەوشتی بکرێت.

بەپێی ئەم ڕوانینە، لاشە بووەتە مافی تاکەکەسی مرۆڤ، هەرچیی دەوێت پێی دەکات: حەز بە هەمان ڕەگەزی خۆی دەکات، ناسنامەی جنسیی خۆی دەگۆڕێت، یان هەر لەبنەڕەتەوە ڕەگەزی خۆی دەگۆڕێت!

هەموو شت ڕەوایە مادام دڵخۆشیی پێ دەبەخشێت، هەموانیش دەبێت ڕێزی ئەم دڵخۆشییە بگرن، چونکە ئەمە بەڕەوشتکردنی نوێیە، هەر ئەمەیش گرنگە. ڕەوشتیش زوو ئەرکی لە گۆڕ ناوە و لێرەیشدا خودی ئەرکیش لە بەرامبەر چێژدا لە گۆڕ دەنێین.

بۆ نموونە: ڕەوشتی ئایینی ڕێگریی لە شێواندنی دەستەنقەستی ئەندامەکانی مرۆڤ دەکرد، بەهۆی چەمکێکی ڕوون و ڕەوانەوە، کە پابەندبوونە بە پەرستشی خوداوە، هەمان شت لە ڕەوشتی ئەرکدارکراو (واجب)دا دەبینین، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە؛ ئەویش سووکایەتینەکردنە بە مرۆڤبوونی مرۆڤ، ئەمە ئەو بنەمایە بوو سەرچاوەی قەدەغەکردنی ڕەگەزگۆڕین بوو - بە یاسا - لە زۆرێک لە وڵاتە ئەوروپییەکان، تاکو سەدەی ڕابردوو.

بەڵام لە چەرخی (پاش بەڕەوشتکردن)دا، (من) لە سەرووی هەموو بەهایەکەوەیە، بۆیە ڕەگەزگۆڕین چیتر کارێکی شەیتانی نییە و پێشکەوتنێکی قەشەنگە. ئەمە چەرخی سەرخستنی دەستبردنە بۆ خود، بۆیە ئاساییە ڕەگەزگۆڕ و هاوڕەگەزبازەکان لە گوناهبار و دەرووننەخۆش و نەفرینکراوەوە ببن بە بەشێک لە کۆمەڵگە و ڕەوشتە دروستکراوەکان پشگیرییان بکەن و دەبێت هەموان قەبووڵیان بکەن و ڕازی بن بەو حاڵەی تێیدان، بەڵکو

بانگەشەیشی بۆ بکەن مادام دڵخۆشیی تاکەکەسی فەراهەم دەکات.

ئەمانە بوونەتە پێوەری کۆمەڵگە، کە نابێت دەستیان بۆ ببردرێت، بەڵام ئەم پێوەرانە بە نەرمی و لاستیکی دەمێننەوە، بۆ ئەوەی هەموو ئاراستەیەکی مرۆڤایەتی لەخۆبگرن؛ بە چاونووقان لە لادانەکانی، چونکە کەسانێک هەن باوەڕیان پێیانە.

تا ئەو کاتەی تاکێک هەبێت باوەڕی پێی بێت، دەبێتە پیرۆزە نوێیەکە، بەم شێوە بەسەرسووڕماوی دۆش دادەمێنیت کاتێ فەیسبووک نامەیەکت بۆ دەنێرێت و پێت دەڵێت: "بەهای کۆمەڵگەکەت پیشێل کردووە"، تۆیش بەهێمنییەکەوە، کە خاڵی نییە لە تێڕامان، دەڵێیت: "کام بەها؟!"

# ناوەرۆك

05 THE WEST AND THE CORRUPTION OF CHILDHOOD

# ڕۆژئاوا و ژەهراوییوونی منداڵی

ڕۆژاوا ژیارێکی ساختەیە و لەسەر پێی خۆی نەوەستاوە، بەڵکو بە مژینی خوێنی گەلانی دیکە ئەم شارستانییەتە ماددییەی ئەمڕۆی بینا کردووە، گەلانی دیکەیان چەوساندووەتەوە و خەڵکەکەیان کوشتوون و نازونیعمەتی وڵاتەکانیان بەتاڵان بردوون، ئەمانە هەموویان لە ژێر ناونیشانێکی جوان و سەرنجڕاکێش، کە بریتییە لە ئازادکردن و دەرهێنانی گەلە داگیرکراوەکان لە دواکەوتوویی و ڕزگارکردنیان لە نایین. کاتێک باسی مافەکانی مرۆڤ دەکرێت خۆیان وەک سەرمەشق و پێشەنگ لە ئەم بوارەدا نیشان دەدەن، بەڵام ئایا بەڕاست ئەمە وایە؟ بەراوردی دەکەین لەگەڵ ڕەوشتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێت) لە کاتی جەنگەکانیدا. باسی مێژووە خوێناوییەکەیان دەکەین چییان بە گەلانی ژێردەستەیان کردووە لە ئەمسەر بۆ ئەوسەری دونیا. باسی تاوانەکانیان دەکەین بەرامبەر هیندەکان و یابانییەکان و جەزائیری و ئەفریقییەکان و دادگاکانی پشکنین، تا دەگاتە دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمریکا و زۆر زیاتر.

ئەگەر دەڵێیت ئەمە مێژوو بووە و لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدراونەتەوە، ئێمەیش دێین و وەڵامت دەدەینەوە و باسی ئازادیی مەرجداری فەڕەنسیت بۆ دەکەین، باسی ڕاستڕەوە توندڕەوەکانی ئەمڕۆ دەکەین، باسی ڕەوشی پەنابەران لە ڕۆژاوا دەکەین؛ لە کۆتاییشدا باسی بەکۆیلەکردن و بەکارهێنان و سەرلیشێواندنی منداڵ دەکەین بە هەموو ئەو شێوانەی، کە بە خەیاڵدا دێن.

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

نرخی 3000 دینار

9 789922 690544